لە بڵاوکراوەکانی
(پەنجاهەمین ساڵیادی کۆچی دوایی یەکەم مەلیکی کوردستان شێخ مەحمودی حەفید)

مامۆستا جەعفەر

# شاری سلێمانی

## مەڵبەندی گروپە کۆمەڵایەتییەکان 1820-1920

سلێمانی 2006

ماموستا جەعفەر

# شاری سلێمانی

## ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان

## (١٨٢٠ ـ ١٩٢٠)



بنکەی ژین

سلێمانی ٢٠٠٦

٣٠٥,٥١٣

ف ٢٣٤ فازیل کەریم ئەحمەد

شاری سلێمانی: ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان ١٨٢٠-

١٩٢٠/ دانانی فازیل کەریم ئەحمەد "مامۆستا جەعفەر". ــ سلێمانی:

بنکەی ژین، ٢٠٠٦.

ئیندێکسی ناو: ل (٢٧٦-٢٩١).

٣١٠ل: (١٦,٥ × ٢٣ سم)، وێنە، بەڵگەنامە.

١- سلێمانی- ململانێی کۆمەڵایەتی ئـ- ناونیشان

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێنو پێرستی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

- زنجیرە: ٤٦
- کتێب: شاری سلێمانی، ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان (١٨٢٠ - ١٩٢٠)
- نووسەر: مامۆستا جەعفەر "فازیل کەریم ئەحمەد"
- تایپ: لیزان سامی، هەرێم جەزا
- بەرگسازی: جوان قادر سۆفی
- تیراژ: ١٥٠٠
- ژمارەی سپاردن: (٨١٧)ی ساڵی ٢٠٠٦
- شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

## بنکەی ژین

بۆ بووژانەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەییورۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستان عیراق– سلێمانی، سەرچنار، گەڕەکی ١١٩ ، شەقامی ٧٥ سەگرمە، خانووی ٧٣

سنووقی پۆست: ١٤ تەلەفۆن: ٣١٢٣١٠٥ مۆبایل ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یا ٠٧٧٠١٥

E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com

پێشکەشە بە...

## مامۆستا جەعفەر

دواجار لەساڵی ١٩٧٥ یەکترمان لەبەردەم چایخانەی شـارەوانیی سـلێمانیدا بینـی، بەڵێن بوو جارێکی تر یـەکتر ببینینـەوە. زۆرم چـاوەڕوان کـردو هـەر نـەهات، کاتێـك بەخۆمم زانی ئەو لەبەردەمی پەتی سێدارەدایە.

ئێستاش پاش تێپەڕبوونی ٣٠ ساڵ بەسەر شەهیدبوونی ئەوو شیهابی شێخ نوری، هەرجارێ بەبەردەم شوێنی چایخانەی شارەوانیدا تێدەپەڕم‌و پۆلە کۆترێکی سپی بەئاسمانەوە دەبینم، هەست دەکەم ئەوە ڕۆحی ئەوانەو بە ئاسمانی ئەم شارەدا دەسوڕێتەوە. دەزانم! زۆر چاکیش دەزانم، نە من وەکو ئەوان دەتوانم بفرم‌و نە ئەوان دەتوانن دابەزنە خوارەوە...

ڕێکەوتێکی سەیری پێزانین‌و ئەمەکداری ناوی شەهیدێك بۆ من بووە خاچێکی گەورەو گران‌و تا ئەو ڕۆژە دەمێنم، بەسەر شانمەوە دەبێت. سەرەتای شۆڕش واباو بوو، هەرکەسێك دەچووە شاخ هەر لە ڕێگەوە ناوێکی (نهێنی) نوێی بۆ دادەنرا.

شەهید ئارام چەند هەفتەیەك پێش شەهید بوونی خۆی‌و پاش ساڵێك لە شەهید بوونی شەهید جەعفەر، کاتێك زانی ئێمە هاوڕێی یەکترین، پێشنیاری کرد، وەکو زیندوو ڕاگرتنی بیرەوەری سەرکردەو مامۆستایەك، نێوی (مامۆستا جەعفەر)م بەسەردا ببڕێت، بەو هیوایەی ئاڵاکەی ئەو نەوی نەکرێت‌و پەیامی سیاسیی ئەو باشتر ڕابگەێنرێت.. هیوادارم توانیبێتم یەك لەهەزاری ئەو بکەم..

مامۆستا جەعفەر

# پێڕست

**بابەت** | **لاپەڕە**

نزیکەی بیست ساڵ لەمەوپێش، پرۆفیسۆرێکی کۆمەڵناسی ئەڵەمانیی ناسیاو پێیگوتم: ((ئەگەر بتوانی نووسینو بەرهەمی سۆسیۆلۆگە کوردە بەناوبانگەکانم بۆ پەیدا بکەیت، بۆ ئەوەی باشتر لەکێشەی کورد تێبگەم، هەر زۆر سوپاست دەکەم)).

منیش گوتم: ((من جارێ کتێبەکانی خۆمم لەسەر کۆمەڵی کورد نەنووسیووە!))

پرۆفیسۆری داماو، کە ناوی (میشائیل نۆیمان) بوو، تف لەقورگیدا ووشك بوو، گوتی: "تێناگەم چی دەڵێیت؟"

من هەر بە سوبعەتەوە گوتم: ((بەداخەوە کورد جارێ کۆمەڵناسی نییەو هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیمان نییە، تا بتوانیین ناوی لێ بنێین ـ لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆگی ـ ڕەنگە من یەکەم کەس بم کە بمەوێ لەداهاتوودا لەسەر کۆمەڵی کورد بنووسمو منیش جارێ یەك دێڕم نەنووسیووە..))

ئەو بەدەموچاویدا دیار بوو، کە لەوەڵامدانەوەکەی مندا، تووشی نائومێدیی گەورەو حەپەسان هاتبوو، قسەیەکی گوت، کە تا ئەو ڕۆژەی لەژیاندا بم، بیرم ناچێتەوە.

ئەو گوتی: ((چۆن گەلێك دەتوانێ ڕزگار بێت، گەر سۆسیۆلۆگو لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆگیی باشی نەبێت؟))

من بزەیەکم بۆ کردو ئەو بەسەر سامییەوە لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو:

((کاری سیاسیی جیدی پێویستی بەکاری کۆمەڵناسی باشی سەرکەوتوو هەیە. ئێوە دەوڵەتیشتان بۆ دروست بکرێت، تووشی هەزارو یەك کێشەی سیاسییو کۆمەڵایەتی زۆر قورس دەبن. خەڵکی سیاسیی، لەناوەڕاستی شەپۆلی شێتو چەمووشی ڕووداوەکاندا قومپاسی (قیبلەنما) پێنەبێت، بەرەو کوێ، لەتاریکە شەودا سەوڵ لێدەدات؟))

* * *

من پێموانییە، نە ئەم نووسینەو نەنووسینەکانی پێشووتریشم، هەروا بەئاسانی لەخانەی لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆگیدا جێگەیان ببێتەوە. یەکێك دەتوانێ ئەم کارە بکات، کە هەموو کاتی خۆی تەنیا بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردبێتو ناچاری خۆدزینەوەو دەست بەکاتەوە گرتن نەبێتو لەناو دەزگایەکی لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆگیدا کاربکات.

گەورەترین کەلێن لەم پرۆژەیەدا، رەنگە نەبوونی سەرچاوەی کوردیو وەرنەگێرانی بەرهەمە سەرەکییە کلاسیکییەکانی مارکسو ماکس ڤێبەرو ئیمێل دورکهایمو نۆبەرت ئیلیاسو.. هتد بێت، بۆ سەر زمانی کوردی. نەشارەزایی لەزمانەکانی لاتینی، ئینگلیزی، فەرەنسیو ئەڵەمانی یارمەتی خوێندکاران نادات، بەزمانی ئەسڵی سەرچاوەکان بخوێنرێنەوە. وەرگێرانە کوردییەکەش لەبەردەستدا نەبوو، ئیدی ئەوە خوێندکار بە ناچاری خۆی بە هەندێ تێکستی لاوازی وەرگێردراو گرێدەدات، کە هیچ سوودێکی ئەوتۆیان بۆی نابێت.

لەبەردەم پردی وەرگێراندا، کێوی سەختی چەمکی زانستی تایبەت (تێرمینۆلۆگی ـ Terminology) قوت دەبێتەوە، کە زمانی کوردی تێیدا هەر زۆر هەژارەو هیچی نییە. نەبوونی چەمك (تێرم) رێگرە لەبەردەم لێکۆڵینەوەی جیدی سەرکەوتوودا. کێشەکە بەوەرگێرانی حەرفیو داتاشین چارەسەر ناکرێتو پێویستمان بەکات هەیە تا چەمکە کۆمەڵناسییەکان، جێگەی خۆیان دەکەنەوە...

* * *

هەر وەکو چۆن باوكو دایك بێچووی خۆیان چاکتر دەناسنەوە، منیش نووسینەکانی خۆم چاك دەناسمو رێگە بەخۆم نادەم، بەو مامۆستا ئەڵەمانە بڵێم، خەونەکانی ئەو، ئەوە خەریکە دێنە دی. یەکێك پێشینەی فەرهەنگیی دەوڵەمەندی نەبێتو ژیانی خۆی بۆ کارێك تەرخان نەکردبێت، چۆن دەتوانێت ئەوە بنووسێت، کە لێی چاوەروان دەکرێت؟

لەگەڵ ئەوەشدا من ئەم نووسینە بەکارێکی پێویست دەزانم. ڕەنگە ئەمە یەکەمین کاربێت کە لەسەر بابەتی چەمکی هاوشاریبوون، واتە: بازرگانو کاسبو فەرمانبەرو رووناکبیر کرابێت. لەئەدەبیاتی رۆژاواو رۆژهەڵاتدا، بەهەزاران لێکۆلینەوە لەسەر ئەم چینە نووسراون. ئێمە ئەمرۆش لەروومان نایەت باسی ئەوە بکەین، کە چینی بۆرجوازیمان هەیە یان هەبووە. چینێك لەشار لەدایك بووبێتو بەبازرگانیو کاری پیشەیی ژیابێت، هەر زۆر لەچینی جووتیارو دەرەبەگ جیاواز دەبێت.

ساڵی ١٨٨١ لەشاری سلێمانیدا، ئەم چینە لەناو شاردا راپەڕیوەو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ شاری ئازاد کردووە. ساڵی ١٩٠٢ بازرگانو کاسبی شاری سلێمانی، بۆ ماوەی یەك مانگ مانیگرتووەو سێ برووسکەی نارەزایی ڕەوانەی (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم) کردووەو داوای (ئازادی)و (دادپەروەری) یان بەگوێرەی دەقە عوسمانییەکە: (حریە) و (عدالە) کردووە. کەچی ئێمە هەر لەبەر ئەو ئەفسانەو داستانو میتیۆلۆجیا ناسیۆنالیستییەی کە ئاسمانی بیرکردنەوەمانی داگیر کردووە، چەپترینو پێشکەوتووترین مێژوونووسمان ناوێرێت ڕاستییەکان وەکو خۆی بەڕاشکاوی بگێڕێتەوە. ئەمە کارەساتێکە، کە خۆمان هەست ناکەین، لەچ کارەساتێکی نەتەوەییدا دەژینو هەستی پێ ناکەین.

شانازی بەخەباتی خەڵکی شارەوە ناکەین لەپێناوی ئازادیو دادپەروەریو دژی چەوسانەوەو پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کردویانە، هەر لەبەر ئەوەی ڕاستییە مێژووییەکان لەگەڵ ئەو (وەهم)ە نەزۆکانەدا ناگونجێت، کە ئێمە بڕوامان پێی هەیە!

* * *

ئەوەی ڕاستی بێت، ئارەزوویەکی سەیر هانیدام بۆ جاری دووەم ئەم کتێبە چاپبکرێتەوە. چاپی یەکەم بەهۆی زۆریی هەڵەی تایپکردنو گوێنەدانی لەشکری

بێ سەلیقەی هەڵەبڕ، بە پەلاماری کوتوپڕی پەنجەی تایپیستەکان، کە خۆیان لەزۆریی پەڕینی ڕستەو بڕگەو لاپەڕە بە بەرپرسیار نازانن، ، ئەوەندە هەڵە سنوور دەبەزێنێت، کە نووسەر تێیدا شەرمەزار دەبێتو کەس تاقەتی خوێندنەوەی کتێبەکەی نامێنێت. چاکتر وایە لەمەودوا نووسەران خۆیان کاری خۆیان تایپبکەنو منەتی قەساب هەڵنەگرن.

ئەگەر خوێنەرانی ئازیز تووکیان لەچاپی یەکەمی کتێبی: (پێکهاتنی چوارچێوەی ئابووریو سیاسیی چینی بۆرجوازی لەشاری سلێمانیدا ١٨٢٠ - ١٩٢٠)[1] کردبێت، ئەوە مافی خۆیانەو منیش وەکو ئەوان ڕەنجاوو دڵشکاوم. چاپی یەکەم بەکتێبی خۆمی دانانێمو نامەوێ کەس بۆ کاری زانستی بەکاری بهێنێت. نازانم کەی دەمپەرژێتە سەر ئەوەی جارێکی تر دوای ئەو سەرچاوانە بکەوم.

ناونیشانی کتێبەکەشم گۆڕی، چونکە ناونیشانی پێشوو بۆ نووسینێك بە ئەڵەمانی نووسرابێت، ئەوە ڕەنگە کێشەیەکی ئەوتۆ ڕوو نەدات، بەڵام بۆ خوێنەری کورد تۆزێ تەمو مژاوییەو کەس ناتوانێ لەخوێندنەوەی ناوی کتێبەکەوە، هەر یەکسەر بزانێت ئەو کتێبە لەسەر چییەو باسی چی دەکات؟ فراوانکردنەوەی لێکۆڵینەوەکەش ئەوەندەی تر جیاوازیی نێوان ناوو ناوەڕۆکی دروستکردووە.

ئەم کتێبە دەبا پاشکۆیەکی قەبەو زل بە دوای خۆیدا ڕاکێشێت، کە زۆر بەڵگەنامەی بڵاوکراوەو بڵاو نەکراوە، کە راستەوخۆ پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەبێت، جوانتر دەبوو لەبەشی پاشکۆدا جێگایان بکرایەتەوە.

((چەند بەڵگەیەکی مێژوویی)) کە مامۆستا (مستەفا نەریمان)[2] لەساڵنامەی عوسمانییەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردیو کاك ئازاد هیدایەت دەلۆ لەگۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧)دا بڵاویکردووەتەوە، ئەوە مولکی وەرگێڕەو دەبا بەگوێرەی قانوون، ئێمە ئیجازەی دووبارە بڵاوکردنەوەی لەخێزانو کەسو کاری وەربگرین.

بەلاَم ئەوە نەكراوە، داواى لێبوردنيان لێ دەكەين، هەرچەند هەولْمان داوە، پەيوەندييان لەگەلْدا بكەينو داواى رێگە پێدانييان لێ بكەين، بەهۆى وەزعى ئێستاى بەغدا دەستمان پێيان نەگەيشت.

شيعرەكەى سالم (عەزيز بەگى بابان) كە كاتى خۆى (محەمەد مستەفا كوردى) بەشێكى بلاَوكردەوەو پاشان (د. مارف خەزنەدار) لەكتێبى (مێژووى ئەدەبى كوردى)[٣] بەرگى سێيەمدا بەتەواوى هەر (٩٨) بەيتەكەى بۆ يەكەمين جار بلاَوكردووەتەوە، دەمەويست بەيت بە بەيت لەسەرى بنووسم، بەهۆى بێكاتىو سەرقالْييەوە، دەستم لەهەويرى ئەو پرۆژەيە هەلگرت. ئێستا هەر دنەى كاك (محەمەد مستەفا - حەمە بۆر -[٤]) دەدەم ئەوكارە بكات، پاش ئەوەى بەنامەو بەقسە، چەندين جار تكام لەمامۆستا (محەمەدى مەلا كەريم) كرد، ئەو بەلْێنەى سەرەتاى حەفتاكان داويانە، ديوانەكەى (سالم) ساخبكەنەوەو شەرحى بكەنو بلاَوبكەنەوە، بهێننە دى. دەزانم بارى تەندرووستى هەردووكيان وەكو بيست سالْ لەمەوپێش نييە، بەلاَم لەوە دلْنيام كەسى تر نييە، يەك لەدەى ئەوانيش شارەزايى لەسالمو كوردى هەبێت. بريا پەنجاى ترى وەكو ئەو دوو برايە هەبووانو ئەو ئەركە لەستۆى ئەوان نەبوايە...

كاك (حەمە بۆر) ئەم شيعرەو هەندێ بەيتى ترى خستووەتە سەرو بە(١١٧) لاپەرە راڤەكارييەوە، بەتايپكراويەوە بۆى ناردمو مالْى ئاوا بێت. من پرسيارم لە (دكتۆر كەمال فوئاد) كرد، كە ئەو سەرجەمى دەسنووسەكانى كتێبخانەى دەولْەتى پرۆيسى خوێندووەتەوەو كۆپى رەوانەى لاى كاك (محەمەدى مەلا كەريم)و (د. مارف خەزنەدار) كردووە، كە شيعرەكەى سالم تەنيا (٩٨) بەيتە، نەك (١٥٧) بەيت. راڤەكەى كاك (حەمە بۆر) خۆى بەكارى (شكلى)يەوە خەريك كردووەو زۆرجار نيشانى نەپێكاوە. بۆيە من تەنيا شيعرەكەى (سالم)ى (د. خەزنەدار) سەرلەنوێ بلاَودەكەمەوە...

دەبا شیعرە بڵاونەکراوەکەی (مەلا حەمدوون)یش بڵاوبکرێتەوە، بەڵام لەبەر دڵی خەڵك‌و هەست‌و سۆزی ئەوانەی رەخنەیان ئاراستەکراوە، منیش گوێی خۆمم لێ کەڕکرد، وەکو ئەوانەی تر، کە ماوەی پتر لە (٩٠) ساڵە ئەو شیعرەیان لایەو لەبەر خاتری ئەم‌و ئەو بڵاویان نەکردووەتەوە. منیش چوومە پاڵ ئەوان.

ئەم نووسینەی من هێشتا زۆر کەلێن‌و ناتەواویی تێدایەو هەق نەبوو، لەبڵاوکردنەوەی چاپی دووەمدا پەلە بکەم. ماوەی دەساڵ لەمەوپێش چاوم بە سەرچاوەی ئەوتۆ لەکتێبخانەکانی ئەڵمانیا کەوتووەو ئێستا هەرچەند لەوێش هەوڵمدا دەستم نەکەوتنەوە. بێگومان هەندێکیان یەکجار سوودیان بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە دەبوو.

دوو گەڕیدەی ئەڵمان کە ناویان (بەرلینەرو بورخارد)[٥] لەسەر کاری زێڕنگەری کتێبێکیان نووسیووەو ناوی (کاری زیوگەری لەکوردستاندا)یە، ژمارەیەك وێنەی دەگمەن‌و نایابیان لەسەر کاری زێڕینگەری (زیوگەری) گرتووەو ساڵی ١٩٢٢ لەشاری بەرلین بڵاویان کردووەتەوە.

Berliner, R. und Borchardt, P.: Silberschmiedearbeiten aus Kurdistan, Berlin, 1922.

هەق بوو ئەم کتێبە، یان ئەم کەتەلۆگە بەبێ زیادو کەم بکرێتە کوردی‌و بڵاوبکرێتەوە، بەڵام تەنیا پێشەکییەکەم کردووە بەکوردی‌و لەبەشی پاشکۆدا دانراوە. زانیارییەکانی نووسەران، دوورو نزیك تیشك دەخەنە سەر بەشێك لەژیانی کۆمەڵایەتیی شاری سلێمانی لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانی.

مامۆستایان (عبدالرقیب یوسف)و (سدیق ساڵح) ساڵی ٢٠٠٤ کتێبی (لەبەڵگەنامەکانی حکومەتی شێخ مەحمود - تۆمارێکی شارەوانی سلێمانی ١٩٢٣-١٩٢٤)[٦] یان بڵاوکردەوە، ئەم کتێبە هەر زۆر زۆر بەنرخە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ لەسەر حکومەتی شێخ مەحمود لێتۆژینەوەی زانستی‌و کۆمەڵایەتی بنووسن.

لەرێگەی ئەو دۆکۆمێنتو فاکتو ژمارانەوە، دەتوانرێت ستراکتووری ئیداریو بەڕێوەبەرایەتی سەر لەنوێ دارێژرێتەوە (ریکۆنسترەکشن).

من بۆ خۆم لە (ئەحمەد خواجە) ۱۹۹٥ ەوە کۆمەڵێك زانیاریم لەسەر شێوەی بەڕێوەبەرایەتی دەورانی شێخ مەحمود تۆمارکرد بوو، لەم کتێبەدا سوودم لێیان وەرگرتووە. کارەکەی مامۆستایان (عبدالرقیب)و (سدیق سالح) بریتییە لە بەلگەنامەو سەرچاوەی دەستی یەکەمو ئەم کتێبە زۆر لایەنی نەزانراوو شاراوەی خستووەتە بەرتیشکی رۆژ.

نووسەرە لاوەکان، دەتوانن بەبێ گرێوگۆڵ، بەپشت بەستن بەخشتەی داهات وەرگرتنو شێوەی سەرف کردن، سروشتی دەسەلات بدۆزنەوە. هەر بۆ نموونە من پێشتر نەمدەزانی وەزیفەیەك هەبووەو پێیگوتراوە (چراچی) یان (باشکاتب).. هتد. لەرێگەی تۆماری شارەوانییەوە چەندین پۆستو کار بەرچاو دەکەون، کە ئێستا نەماون. ئەم تۆمارە، تایبەتە بە شارەوانیو بەداخەوە ئێمە لەسەر دامەزراوەکانی تر هەر زۆر کەم دەزانین.

پێش بلاوکردنەوەی ئەم کتێبە هاوبەشە، مامۆستا (سدیق سالح) لەسالی ۲۰۰۳دا کتێبی (تۆمارێکی شارەوانی سلێمانی ۱۹۱۹ـ ۱۹۲۲)ی[٧] بلاوکردەوە. ئەم کتێبەش بۆ تێگەیشتنی رەفتارو قەوارەو هێزی داراییو ئابووری گروپە کۆمەلایەتییەکان یەکجار بەسوودە.

جگە لەم دوو کتێبە، برایان (رەفیقو سدیق سالح) کارێکی ئەفسانەیی بێوێنەیان لەبواری سەر لەنوێ چاپکردنەوەی (بانگی کوردستان، رۆژی کوردستان، ئومێدی ئیستقلال، ژیان، نزار،... هتد) کردووە، هەوەکو چۆن لەمێژووی رووناکبیریو ئەدەبی ئەلمانیدا (بروودر گرم ـ Bruder Grimm) هەیە، واتە: برایانی گرم، لەزۆر شوێن پەیکەریان بۆ دانراوەو کەم شار هەیە شەقامێك ناوی شەقامی (برایانی گرم) نەبێت، برایانی ئێمەش هەرچەند هەردووکیان هێشتا گەنجن، بەلام دوو ئەوەندەی (برایانی گرم) کاریان کردووە.

ئەوان هەر بەوەوە ڕانەوەستاون، کە لەماڵەوە خزمەتی ژیانی ڕووناکبیری کوردی بکەن، بەڵکوو (بنکەی ژین) یان بەیارمەتی چەند برایەکی تر دامەزراندووە. ئێستا ئەم دامەزراوەیە بەپلان هەوڵدەدات، بەهەزاران بەڵگەنامەو دۆکۆمێنت لەدەستی نەمانو تیاچوون ڕزگار بکات.

لەناو بنکەی ژیندا کاک (عەبدوڵڵا زەنگەنە)ش[8] جێگەی دەستی دیارەو شان بەشانی مامۆستایان (عبدالرقیب یوسف)و (ڕەفیق ساڵح)و (سدیق ساڵح) قەڵەمێکی ڕەنگینی هەیەو کاری زۆر باشی کردووە. مەگەر یەکێکی وەکو من بزانێت بۆ پەیداکردنی ژمارەیەکی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) چەند خۆی ماندوو کردووەو بڵاو کردنەوەی هەرچوار ژمارەکە بە وەرگێڕانی گوتارە عوسمانییەکان بۆ کوردی چەند کاتو شەونخوونیی لێی ویستووە.

کارە مەزنەکانی مامۆستایان (محەممەد عەلی قەرەداخی)[9]و (کەمال رئووف محەممەد بابی لالۆ"[10]) بۆ ئەم نووسینەی من زۆر بەسوود بوون. ئەمانە لەبواری دۆزینەوەو ساخکردنەوەی دۆکۆمێنتو بەڵگەنامەدا ڕەنجی فەرهادانەیان کێشاوەو بەداخەوە کەم کەس لەگرنگیو بایەخ هەوڵو تەقەلای ئەوان تێدەگات. من دڵنیام ئێمە ئەگەر ناوەندێکی پارێزگاریکردن لە دەسنووسو بەڵگەنامەمان هەبوایە، ئەوا بەهەزاران دەسنووسو دۆکۆمێنت، بە هەرزانو تالان بۆ دەرەوەی وڵات نەدەڕۆیشتنو خۆمان ڕۆژێ لەرۆژان سوودمان لێیان وەردەگرت.

کتێبەکەی کاک (ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە) (سلێمانی)، کە بەدوو بەرگ بڵاوکراوەتەوە، بۆ ئەوانەی لەسەر هەندێ لایەنی سۆسیالو ئیتنۆلۆگیی سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی (٢٠) دەنووسن، سوودی خۆی هەیە.

* * * *

جێگـەی داخ و کەسـەرە، دامـەزراوە زانـستییەکان: زانکـۆ، کـۆڕی زانیـاریو وەزارەتی ڕۆشنبیری، هێشتا زۆر ئەرکی سەرشانی خۆیـان جێبەجـێ نـەکردووەو هیچ پلانێکیان بۆ بووژاندنەوەو پاراستنی دۆکۆمێنتو بەڵگەنامە نییە.

زانکـۆ، بەتایبـەتی بەشـی کۆمەڵناسـیو زانـستی سیاسـیی، دەتوانـن بـۆ لێکۆڵینەوە لەسەر هەندێ بڕگەی مێژوویی بەرنامەی پلان بۆ دانراویان هەبێت.

بڵاوکردنـەوەی ئـەم ژمـارە زۆرە لەبەڵگەنامـە، پێویـستیی سـەر لـەنوێ نووسینەوەی مێژووی پاش یەکەمین جەنگی جیهانی دەکاتە ئـەرکێك، کـە دەبـێ پەلـەی تێـدا بکرێـت. پـێش راپـەڕینی ١٩٩١ ئەگـەر گێڕانـەوەی داسـتانو چیرۆك ئامێز بۆ ڕووداوەکانی دیـرۆك، بیانوویـەکی هـەبووبێت، ئـەوا پـاش چەسپاندنی دەسەڵاتی کوردیو فەراهەم بـوونی هەلومـەرجی باشـتر بـۆ لێکۆڵـەرو لێـتوێژەر، نەمانی هەڕەشەی نەمان، ئەو بیانووە بەدەستەوە ناهێڵن.

ئـەوەی بەڵگەنامـەکانی ئـەم سـەردەمە بخوێنێتـەوە، کـە مامۆسـتایان (عبـدالرقیب یوسـف)و (ڕەفیـق سـاڵح)و (سـدیق سـاڵح)و (محەمـەد عـەلی قـەرەداخی)و (عەبـدوڵڵا زەنگەنـە)و (کـەمال ڕەئـووف محەمـەد) بەشـێکیان بڵاوکردووەتـەوە، یەکـسەر هەسـت دەکـات، نووسـەرو لێکۆڵـەران هـەر زۆر بەجێماون. یەکێکی وەکو کاك (نەوشیروان مستەفا ئەمین) لە (سەردەمی قەڵەمو موراجەعات)و (چەند لاپەڕەیەك لەمێـژوی ڕۆژنامـەوانی کوردی ـ ب١ ، ب٢)دا[١٢] چاکتر سوودی لەرۆژنامەکانی ساڵانی بیستەکانی سەدەی ڕابوردوو وەرگرتـووە، تـا زۆر کەس، کە لەزانکۆدا کورسیی (مێژووی نـوێ) و (مێـژووی ڕۆژنامـەوانی) یـان هەیە.

من هەر لەبەر ئەوەی ساڵانی بیستەکانی سـەدەی پێـشوو، دەکەوێتـە دەرەوەی بازنـەی ئـەو سـەد سـاڵەی بـۆ نووسـینەکەم دیـاریم کـردووە، نەمویـست زیـاد

لەپێویست پانتایی ستراکتوورو میکانیزمی ئیداری ئەو سەردەمە، بهێنمە ناوچەقی بابەتەکەوە، کە لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆگی سەربەخۆی پێویستە.

نازانم ڕۆژێك لەڕۆژان دەمپەرژێتە سەر ئەوەی مێژووی بیر لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم بنووسمەوە، یان سەرئێشەی ژیان بۆ تاراوگەی پرۆژەیەکی تر ڕاپێچم دەکات؟

*    *    *

لەوڵاتی ئێمەدا، هێشتا ئەوە نەبووەتە باو، لەسەر شار بنووسرێت، هەرچەند دەسەڵاتی کوردی دەزانێت، ئەمڕۆ شار کۆڵەکەی سەرەکیو بڕبڕەی پشتی کۆمەڵە. شاخ، ڕەنگە لەسەر نەخشەی عەسکەری یان ستراتیجیی دەزگاکانی گەشتوگوزار، دەزگا سەربازییەکان گرنگیی خۆی هەبێت. هەر دەسەڵاتێك شار پشتی تێکردبێت، نەیتوانیوە لەشاخ خۆی بگرێتەوە. شار پێویستی بەتێگەیشتنی دەسەڵاتی سیاسیی هەیە. لەهەڵبژاردندا، هێزو لاوازیی دەسەڵاتو حیزبو ڕێکخراوەکان دەردەکەون. ئێمە لەمەودوا ناتوانین تەنیا بەگوتار ڕازاندنەوەو سیحری چاوی کامێرای تەلەفزیۆنی، دڵی کۆمەڵانی خەڵك بۆلای خۆمان ڕاکێشین. سۆسیۆلۆگیای شار ڕەنگە لەمەودوا بتوانێت دەرگای لێتوێژینەوەو شیکردنەوەی گەرەك بخاتە سەر پشت، لەسەر بنەمای ڕاپرسیو کۆکردنەوەی فاکتو ژمارە، دەربارەی ژمارەی دانیشتوانو فێرگەو باخچەی ساوایانو سەنتەری لاوانو حەوزی مەلەو باخچەی پیاسەو گۆمی سەیرانو یاریگەی وەرزشو مزگەوتو حەمامو... هتد. لایەنی لاوازو بەهێزی دەسەڵات دەردەکەون.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە، لەئەوروپاو ئەمریکادا لەکۆتایی شەستەکانەوە برەوی هەیە، بەتایبەتی پاش تەقینەوەی شۆڕشی خوێندکاران ١٩٦٨. لەناو دەزگاو ئامۆژگاو دامەزراوە زانستییەکاندا پێیدەگوترێت (کۆمەڵناسی شاری نوێ - New Urban Sociology) زۆربەی ئەو کارانەی لەئیتالیاو فەرەنساو

ئەمریکاو ئەڵمانیادا لەسەر ئەم بابەتە نووسراون، بایەخیان بەلێتوێژینەوەی ئیمپیری empirical زانیاری بەئەژمار کۆکراوەتەوەو پاشان شیکراوەتەوە.

دەسەڵاتی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی، بەرامبەر ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتیانەی لەکۆمەڵدا ڕوودەدەن، دەستەوئەژنۆو ساکاوو حەپەساوە. لەماوەی بیست ساڵدا لادێ چۆڵ دەبێتو شاری یەك ملیۆنی دروست دەبێت. دەسەڵاتی سیاسیی، نەتێگەیشتنی بۆ ئەم کێشەو تەنگژەیە هەیەو نەستراتیجیای روونی هەیە، نەدەتوانێ هەنگاوی ڕاست هەڵهێنێت. ئێستا، ٨٠٪ دانیشتوانی کوردستان لەشار دەژینو تەنیا ٢٠٪ دانیشتوان لەلادێدا ماونەتەوە!

((شاری نوێ))ی ئێمە، هەر زۆر بەشێوەیەکی ناسروشتی گەشەی کردووە. شاری ڕۆژاوایی، لەماوەی سەدەیەکدا، ئەوپەڕی ١٠٪ لەژمارەی دانیشتوانو شەقامو گەڕەك دەگۆڕێت. ئەوەی ئێمە، کار لەڕێژەو ڕێژەکاریدا نامێنێت، هەموو سنوورێك تێدەپەڕێنێت. ساڵی ١٩٢٠ واتە: تەنیا (٨٥) ساڵ لەمەوپێش، ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی (١٠٠٠٠) دە هەزار کەس بووە. هەولێر (١٠٠٠٠) دە هەزار کەس بووەو کەرکوك (١٥٠٠٠) پانزە هەزار کەس بووە. دهۆك تەنیا چوار سەد (٤٠٠) ماڵ بووە. ئێستا سلێمانی (٨٥٠٠٠٠) کەسو هەولێرو کەرکوك یەکی نزیکەی ملیۆنێك کەسیان تێدا دەژێتو شاری دهۆکیش نزیکەی (٧٠٠٠٠٠) کەسی تێدا دەژێت.

شارەوانی، ڕێگەی بەدروستکردنی خانوو داوە، بەڵام نەیتوانیوە شەقامیان بۆ قیرتاو بکات. ڕەنگە حکومەتەکانی پێشوو کارەباو ئاویان تەنیا بۆ (١٥٠٠٠٠) کەس دابین کردبێت، ئێستا ئەو دەزگایانە ناتوانن پێویستییەکانی هاوشاری لەئاوو کارەبا دابین بکەن. بەکورتی شارەوانی پێش شەقام دروست کردنو زێرابو ئاوڕاکێشان بەهەزاران پارچە زەوی دابەشکردووە، یان خەڵك بەبێ ڕەزامەندی شارەوانی، واتە بە (تجاوز)، گەڕەکی گەورەی دروستکردووە. کەسانی

(خێرۆمەند) هەرزوو مزگەوتیان بۆ دروست کردوون‌و خەڵك ژیانی تێدا بەسەر دەبات‌و حکومەت ناچار دەکات ئەو زەویانەی کە بەناڕەوا داگیرکراون بەڕەسمی لەسەریان تاپۆ بکات!

بێگومان تۆپەڵبوونی هەژارانی لادێ، لەقەراخی شاردا بەبێ خزمەت‌و پڕکردنەوەی پێویستی، هەستی جیاوازیی چینایەتی، دەوڵەمەندی‌و هەژاری، ناعەدالەتی دروست دەکات. ئەم خەڵکە، حکومەت ناتوانێ داواکارییەکانیان جێبەجێ بکات‌و دڵیان ڕازی بکات، بۆیە دەچنە ریزی ئۆپۆزسیۆن‌و بەتایبەتی دەبنە لایەنگری گروپە دینییە توندڕەوەکان، کە ناتوانن بەڵێنی چاکردنەوەی ژیانی سەر زەویان بدەنێ، بەڵکو بەڵێنی بەهەشت‌و حەفتاودوو حۆری‌و ئەو دونیای پڕخۆشی‌و کامەرانی مسۆگەر بکەن.

هەرکەسێك سەیری قەراخ‌و بازنەی دەوروبەری شار بکات، هەر لەدهۆکەوە تا کەلار دەبینێ یەك مۆدێلە، ئەگەر ئێمە شاری دهۆك وەکو نموونە لەبەرچاو بگرین، لەباکوور، هەندێ تیرەی عەشیرەتی سندی، گلی، بەرواری نیشتەجێ بوون، کەچی لەڕۆژهەلات هەندێ تیرەی دۆسکی‌و مزوری گەڕەکی خۆیان دروستکردووە. ڕۆژهەلات، خەڵکی عەشیرەتی سلیڤانی لەشوێنی کۆنی خۆیان تیادا هەڵکەنراون‌و لەوێ جێگیربوون، باشووریش زۆربەیان بنەماڵەی ئێزیدین.

شاری چوارقوڕنە، لەکاتی دروستکردنی بەنداوی دوکاندا، لەئەنجامی کۆکردنەوەی دێهاتی (گولەك، قوروجە، تەنگژە، باژمووسیان، شیلانە، تۆبەکارە، میرزا رۆستەم) قوتکراوەتەوە. هەر گوندێك ناوی گەڕەکی لێنراوە، هەر گەڕەکێك مزگەوتی خۆی هەیە، لەهەر گەڕەکێك یەکێك بمرێت لەمزگەوتی گەڕەك پرسەی بۆ دادەنرێت. ئەم دێهاتە ـ گەڕەکە لەساڵی (١٩٥٨)ەوە پەیوەندییان لەگەڵ زەوی‌و زاری جارانیانەوە تا ئەمرۆ نەپچڕاندووەو بەشێکیان هەر بەکاری جووتیاری دەژین.

بەشێك لەگەڕەكەكانی هەولێر، كۆلۆنی (مستعمرة)ی نوێی عەشیرەتەكانی دەوروبەری شارن. خەڵكی دزەییاتی، هاتوونە كووران، بەشێك لەبەڕانەتی لەگەڕەكی تەیراوە دامەزراون، خۆشناوەتی، لەسێتاقان‌و سەیداوە جێگەی خۆیان كردووەتەوە. گەڕەكی بیرەژییان، لەئەنجامی كۆچكردنی جووتیارانی گوندی (بیرمژی)ەوە دروستبووە. كۆچی ناچاری زۆرەملێ، گەڕەكی (بەلاشاوا، گێمەدێ، دڕكاوا، پۆتیناوا، ...)ی هێناوەتە كایەوەو هەر ناوی گەڕەكەكان بەڵگەی مێژوویی پڕۆسەی دروستبوونی گەڕەكەكانن‌و هاواری ناعەدالەتی‌و زوڵم‌و زۆری سیاسی‌و كۆمەڵایەتین.

شاری كەلار، لەساڵی (١٩٧٠)ەوە هەر بەناو شارە، بەڵام شارێكی بێ كولتووری شارییە. لەبازاڕەكەیدا گوزەری پیشەگەری جیاجیا نییە (ئاسنگەر، دارتاش، كورتاندروو، ناڵبەند، مسگەر، ...). لەم شارەدا، ئوتێل‌و ریستۆرانت‌و مەیخانە نییە. كەچی لەخانەقی، كە ژمارەی دانیشتوانی نیوەی ئەویش نابێت، چەندین ئوتێل‌و دوكانی فرۆشتنی خواردنەوەی هەیە. یەكێك لەكەلار، بیەوێ قومێك عارەق بەقوزەڵقورتی بكات، دەبێ سواری ئۆتۆمۆبێل بێت‌و تا سلێمانی یان خانەقی نەوەستێت. ئەم (شار)ە بریتییە لەتۆپەڵكردنی زۆرەملێ‌و ناچاری بەشێك لەدێهاتی گەرمیانی ئەمبەرو ئەوبەری سیروان. هەرچی پەروێزخانی‌و سالاری هەیە بەزۆری لە(حەمەی كەریم) كۆبوونەتەوەو كاكەیی، لەبەردەسوورو خەڵكی كۆڵەجۆ، زۆربەیان لەخوار شیروانە نیشتەجێكراون...

لەسلێمانیش هەروایە گەڕەكە نوێكانی ڕۆژاوا، بەگشتی لەقەرەداخەوە بۆ ئەوێ باریان كردووەو ئەو گەڕەكانەی كە لەدامێنی گۆیژە دروستكراون لەشارباژێڕەوە هاتوون.

پێش ساڵی ١٩٧٥، شار شاربوو، لادێش لادێ. شار كولتووری خۆی هەبوو، لادێی داماو نەیدەتوانی بەئازادی پیاسەی ناو شار بكات‌و نان‌و كەبابێك بەئیسراحەت

بخوات. شاریی ئەوەنـدە نوکتـەی لەسـەر دروسـت دەکـرد، لادێـی نەیـدەوێرا بـۆ سەردانیش ڕووبکاتـە شـار. ئـەمڕۆ بنەماڵـە دەوڵەمەنـدو خانەدانـە شـارییەکان، بەگـشتی لاتو پـاتو بێـدەرەتانن، لەچـاو ئـەو پـارەدارە لادێیانـەی، کـە ئێـستا بەملیۆن دۆلار قسە دەکەنو لەگەڵ کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی دوورو نزیـكو ڕۆژاوادا بازرگـانی دەکـەن. شـاریی ویـستویەتی وەکـو فەرمانبـەرو دوکانـدار ژیـان بەسـەر بـەرێتو نـان پەیـدا بکـات. کـوڕی لادێ، بەعەرەبانـەی دەسـتی، مـسو فـافۆنی کۆکردۆتـەوە پـارەی بەیەکـەوەناوەو دەسـتی گەیـشتووەتە هـۆنگ کـۆنگو سـەنگافوورەو جاکارتـا. ئـەم کـارە بەفەرمانبـەرو کاسـبی سـونەتیو خوێنـدکاری زانکۆ ناکرێت!

ئەم نوسینەی من دوورو نزیك پەیوەندی بەسۆسیۆلۆگیای شارو لێکۆڵینەوەی شارەوە نییە. هەرچی (کۆمەڵناسی شـاری نـوێ ـ New Urban Sociology) هەیە، لەسەر کۆمەڵی ئێستای شار کاردەکات، نەك لەسەر ڕابوردوو. کارەکەی من، خوێندنەوەی سۆسیۆلۆگیە بۆ برگەیەکی مێژوویی دیاریکراو.

* * *

ئاسمـانی بیرکردنـەوەی ئێمـە، بەئەفـسانەو میتیۆلۆجیـا داگیرکـراوە. ڕاسـتی لەناو شەوەزەنگی ناڕاستیدا شاراوەتەوە. نەوەی نوێ، پێویـستیی بەخوێندنـەوەی خۆی هەیـە بـۆ ڕابـوردوو، بـۆ ئـەوەی لەئێـستاو داهاتوو تێبگـات. زانکـۆی ئێمـە، دەتوانێت لەسەر کۆمـەڵو مێـژووی دراوسـێ، باشـترین زانیـاریو وێنـە پێشکەش بکـات، بـەلام لەسـەر کۆمـەڵی خۆمـان دەستەپاچـەیەو ناتوانـێ ئـەرکی سەرشـانی خۆی ڕاپەڕێنێت.

ڕەنگـە لای زۆر لێکۆڵـەری ڕۆژهـەلاتی هـەر زۆر سـەیر بێـت، گـەر بنووسـم: زۆربەی ئەوانەی لەسـەر سۆسـیۆلۆگیای شـاری نـوێ نووسـیویانە، کەڵـە نووسـەرە مارکـسییەکانی ئـەمریکاو فەرەنـساو ئیتالیـاو ئـەڵمانیا بـوون، وەکـو (بـارانو

سویزیو ئالتووسەر... هتد). تێکشکانی ئەزموونی بەناو سۆسیالیستی لەساڵی ۱۹۸۹ بەدواوە، زیانی گەورەشی بەچەپ گەیاند لەسەرانسەری جیهاندا. لای ئێمە، زیانەکە گەورەتر بووە، ئەلتەرناتیفی چەپ، داگشان بووە بەرەو ئامێزی بزاڤی ئیسلامی سیاسیو کۆنەپارێزیو سەرلێشێوان.

لەزۆربەی زانکۆکانی ئەوروپادا ـ بەشی فەلسەفەو مێژووو زانستی سیاسیو سۆسیۆلۆگیو ئابووریو ... ــ خوێندنی هێگڵو مارکس، بایەخی خۆیان پاراستووەو بۆ تێگەیشتنی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵو جیهان سوودیان لێ وەردەگرێت، لای ئێمە، هیچ کەسێکی پسپۆر لەو بوارانەدا نییە، ئەگەر هەشبێت، لەبەر دڵی ڕێبازی پەروەردەیی باو، زانکۆ دەیگۆڕێت. ئێمە سوود لەپسپۆرە بەعسیو دواکەوتووەکان وەردەگرین، بەڵام ئامادەنین سوود لەئەزموونی وڵاتە کەپیتالیستەکان وەربگرین.

بەرزکردنەوەی ئاڵای نەفرەت کردن لەتیۆری، شیکردنەوەی کۆمەڵ لەسەر بنەمای خەباتی چینایەتی، هەڵەیەکی گەورەیەو پێویستی بەپێداچوونەوە هەیە. لەزانکۆکانی وڵاتە کەپیتالیستەکاندا جیاوازی لەنێوان مارکسو لینینو ستالیندا دەکرێت. لینینو ستالین لەڕووی تیۆرییەوە ئەوەندە دیلی بیروڕای باکونینو پرۆدۆن بوون، نیوئەوەندەش لەمارکس تێنەگەیشتبوون. من لێرەدا نامەوێ بگەڕێمەوە بۆلای بۆچوونی مارکسیی نوێو بزاڤی چەپی مۆدێرن. تەنیا ئەوە دەڵێم: تیۆریی حزبی پۆڵاینو سیستمی موخابەراتیو کاری مافیایی پەیوەندی چییە بە (ئەنتی دۆهرینگ)و (دیالێکتی سروشت)و (کەپیتال)ەوە؟ ئێرە جێگەی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە نییەو جێگەی ئەوەش نییە: چۆن خەبات بۆ کۆمەڵێکی ئازادی کراوە بکەینو چۆن لەپاشماوەی ئەو هەموو بیرکردنەوە فاشیو نازیو ناسازانە ڕزگارمان بێت؟

من نه لەکاتی خوێندنی باڵادا بواری ئەوەم هەبووە سەرقاڵی هێگڵو کانتو مارکس ببمو نە پاش ئەوەش هەلومەرجی گونجاوم بۆ ڕەخساوەو ئەوەش ناشارمەوە، کە ماوەیەك سەرقاڵی نووسینەکانی (ماکس ڤیبەر) بووم، لەسەر تیۆریی دەسەڵاتو کاریگەرایەتی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی. من بۆ خۆم ناکۆکییەکی زۆر گەورە لەوەدا نابینم، کە یەکێك سوود لەتیۆریی شیکردنەوەی کۆمەڵ وەرگرێت، لەهەمان کاتدا، لەبەر سۆمای چاو، کردارو ڕەفتاری کۆمەڵایەتیو دەوری کاریزماو دەسەڵاتی جیاجیای ناو کۆمەڵ بزر نەکات.

شان بەشانی ئەم تیۆریانە، من بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە گرنگیم داوە بەبۆچوونی نووسەرێکی ئابووریزانی ئەڵمانی کە ناوی (ئولریش کوینسل)ـە، کوینسل لەکتێبەکەیدا (کاروکەسابەتی کەسایەتییە ناسراوەکان) تیشکی خستووەتە سەر ژیانو کاروکەسابەتی دە کەسایەتی جیهانیی ناسراو وەکو (ئەرستۆ، شکسپیر، ناپلیۆن، جۆرج واشنتۆن، بسمارك، غاندی، ...) لەڕێگەی تیشك خستنە سەر کاروکەسابەتەوە، ئەو توانیویەتی چوارچێوەی بیرکردنەوەی سیاسییو فەلسەفی ئەوان بەئاسانی بدۆزێتەوە.

دەمەوێ ئەوەش لەپێشەکیدا بنووسم، کە ئەو کۆمەڵانەی دەوڵەتیان هەیە بەشێوەیەك گەشە دەکەنو ئەو کۆمەڵانەی دەوڵەتیان نییە، بەشێوەیەکی تر گەشە دەکەن. ڕاستە لەئەوروپادا نزیکەی پەنجا نەتەوەو گەلی گەورەو بچووك دەوڵەتیان نییە وەکو (ئێرلەندەی باکوور، باسك، کەتالانی، کۆرسی، ...)، بەڵام مافیان وەکو مرۆڤ تاڕادەیەك پارێزراوە. تەنانەت پاراستنی مافی مرۆڤیش شوێنی نەبوونی دەوڵەت پڕ ناکاتەوە، ئەوە ئێمە ئەگەر گەورەترین گەلی دونیا نەبین، یەکێکین لەو گەلە گەورانەی کە دەوڵەتمان نییە. بەچاوی خۆمان دەبینین لەکوردستانی عیراقدا، ماوەی پێش ڕاپەڕینی ١٩٩١و ماوەی پاش ڕاپەڕینو دروستبوونی حکومەتی هەرێم چەند جیاوازن.

ئێمە لەماوەی سەد ساڵی ڕابوردوودا، ئەگەر دەوڵەتێك، دەوڵەتۆکەیەك، نیمچە دەوڵەتێکمان هەبوایە، بێگومان باری سیاسیی و ئابووریی ئەم وڵاتە بەجۆرێکی تر دەبوو. گەشەکردنی شارێکی وەکو شاری سلێمانی، کە بەشاری هەڵمەتو قوربانی ناوی ڕۆشتووە، ئەگەر دەوڵەتمان هەبوایە ڕەنگە ناوی هۆنگ کۆنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست یان شاری گوڵو سەیرانو گەشتوگوزار بوایەو کەس بەخەیاڵیدا نەهاتایە ناوی (هەڵمەتو قوربانی) بەسەردا دابڕێت، چونکە پێویستی پێ نەدەبوو.

پێش ئەوەی یەکێکی تر ڕەخنە لەم کتێبە بگرێتو هەندێك هەڵەو کەموکووڕی بخاتە روو، دەمەوێ خۆم دەستپێشکەری بکەمو کەلێنێکی زەقو زۆپ بخەمە بەرچاو: من دەمەویست تیشك بخەمە سەر ژیانی ناوەوەی گرووپی بازرگانو کاسبو فەرمانبەرو ڕووناکبیرانی شاری سلێمانی. هەڵبژاردنی چەند نموونەیەك لەهەر خێزانێكو ڕاکێشانیان بۆ دووانو گفتوگۆ لەسەر خۆیانو مێژووی چالاکی ئابووریو سیاسیو کولتووریو پشتگیری قسەکان بەبەڵگەو دۆکۆمێنت، هەنگاوێکی زۆر پێویست بوو. مەخابن هەموو ڕێگەیەکمان بۆ پەیوەندیو لێدوان گرتەبەر، بەڵام کەس ئامادە نەبوو، یەك دوو سەعاتێك لەکاتی خۆی بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخان بکات.

* * *

ئەم کتێبە ئەگەرچی زۆر بەسادەیی نووسراوەو نێوی یەك کەسی لەسەرە، بەبێ پشتگیریو یارمەتی دڵسۆزانەی ژمارەیەك دۆستو ناسیاوو برا نەبوایە، هەڵەو کەموکووڕی دە ئەوەندەی ئێستا دەبوو. میشائیل نۆیمان دەقە ئەڵمانییەکەی خوێندووەتەوەو سەرنجو تێبینی وردی لەسەر نووسیوە. سوودێکی زۆر لەنووسینەکانی ئەو لەئینسکلۆپیدیای فەلسەفی وەرگیراوە. کاك

(عیماد ئەحمەد)و (مامۆستا موحسین) بەش بەش دەقە کوردییەکەیان پێگەیشتووەو کۆیان کردووەتەوەو بۆ چاپدان هانیان داوم.
کاک (حەسەن یاسین) یەکەمین و دواهەمین تایپکردنەوەی بەوردی خوێندۆتەوەو بەشێکی بەرچاو دارشتن و دەستەواژەو ئیملای گۆڕیوە. کاک (عوسمان ئەنوەر) هەڵەی چاپ و رێنووسی گرتۆتە ئەستۆو هەرچی گیاکەڵەو درك و داڵی بەرچاو کەوتووە، هەڵیکێشاوە. کاك (رێبوار حەمە تۆفیق )بۆ دواجار سەیری رێنووسی کوردی و هەڵەی چاپی کردووەو بەوردی چاوی پێدا گێڕاوەتەوە.
پاش کاك(رێبوار حەمە تۆفیق) ، کاك حەسەن یاسین سەرلەنوێ کارەکەی خوێندووەتەوەو لاپەڕە بەلاپەڕە کوردییەکەی مشت ومال کردووە.
رەنگە خوێنەری ئازیز پرسیارێکی رەوای لادروست بێت بۆ خاوەن خەلەو خەرمان بۆ خۆی ماڵەغان و شەنی شکابوو، چاوێك بەدەستنووس و لاپەڕە تایپکراوەکاندا بگێڕێت؟
من بۆ خۆم کەمتر لە دە جاران نووسینەکەم نەخوێندۆتەوەو هەڵەی تایپ سەرئێشەیەکی بەردەوام بووە. تۆ لەلایەکەوە هەڵە بژاردن دەکەیت، کەچی، لەوسەرەوە باوەشێك هەڵەی ناقۆڵای تایپکردنت بۆ دەگەڕێتەوە. بۆیە لەئەنجامدا ناچار بووم داوای درێژکردنی دەستی یارمەتی لەهاوکارو هاورێکانم بکەم. دڵنیاشم بەهەرهەموومانەوە دروێنەکەمان بەشێوەیەك نییە بەدڵی زۆربەی خوێنەران بێت. بۆ هەر هەموو ئەو برایانە سوپاس و پێزانینم پێشکەش بێت.

مامۆستا جەعفەر

سلێمانی ٢٠٠٦/٩/٣٠

## چینی بۆرجوازی

ئەم چینە لەزمانە ئۆروپییەکاندا، بەگوێرەی کاتو سەردەمو بۆچوونو ئایدیۆلۆجیا پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە: پێش شۆڕشی فەرەنسا، دیدرۆ (Diderot) (١٧١٣ ـ ١٧٨٤) لە ئینسکۆپیدیادا نوسیویەتی: بۆرجوازی، دانیشتوانی شارو ستۆین (Citoyen) ئەوانەن، کە لەکاروباری گشتی کۆمەڵدا بەشدارن. تێگەیشتنی ژان ژاك ڕۆسۆ (١٧١٢ـ ١٧٧٨) بەجۆرێکی تر لەستۆینو بۆرجوازی بووەو ئەو پێناسەی تایبەتی بۆ داناون[1].

لەزمانی ئەڵەمانیدا، چەمکی بۆرجوازی لەبواری لێکۆڵینەوەی زانستیو کۆمەڵناسیدا بەکاردێت، بەڵام چەمکێکی خۆماڵیی خۆشیان هەیە، کە (بوێرگەر)ی (Bürger) پێ دەڵێن. بۆرجوازی، تاڕادەیەك وەکو جوێنی لێ هاتووە، هەرچەندە یەکێکی وەکو (ماکس ڤێبەر) خۆی بەبۆرجوازی داناوە. بوێرگەر (Bürger) لەم سەردەمەدا، مانایەکی یاسایی (قانونی) هەیە وەکو ئەندامانی دەوڵەتێك، کە بەرامبەر ستۆین (Citoyen)ی فەڕەنسیو ستزنی (citizen) ئینگلیزییە، بەڵام (بوێرگەر) واتای خۆی وەکو چەمکی بۆرجوازیی فەڕەنسی، لەدەست داوە. من، کەچەمکی بۆرجوازی لەم نووسینەدا بەکار دەهێنم، مەبەستم تەنیا چەمکە مێژووییەکەیە ، کە بۆ چینێك بەکارهاتووە.

پێناسەی بۆرجوازی، پێناسەیەکی زۆر زەحمەتە، چونکە لەبن باڵی یەك پێناسەدا، چەندین گروپی کۆمەڵایەتی دەخرێنە پاڵ یەکترەوە: پلەو پایەو هێزو توانای جیاواز، لەبازاڕداو داهاتی ئابووریو بەرزیو نزمی لەپەیژەی کاری دەوڵەتیو بەڕێوەبەرایەتیداو پەیوەندیی لەگەڵ ناوەندی دەسەڵاتی سیاسیو ئابووریدا، پۆلپۆلێنی کۆمەڵایەتی دەخەملێنێو توێژو گروپی ناکۆك دروست دەکاتو سنوورو چوارچێوەی چین دەبەزێنێو ناهێڵێ لەبن باڵی یەك پێناسەدا، لەپاڵ یەکتردا کۆبکرێنەوە.

# دەرکەوتنی ڕۆڵی سیاسی چینی بۆرجوازی

## کێشەی پێناسە

ئەم نووسینە کورتو سادەیە، بۆ تێگەیشتنی هێزو تواناو هەلوێستی چینی بۆرجوازیی کوردیی شاری سلێمانییە ، لەڕووی ئابووریو سیاسییو کۆمەلایەتییەوە، لەماوەی نێوان سالی (١٨٢٠-١٩٢٠) واتە: سەرەتاکانی دروستبوونی شارێكو سەرەتای دروستبوونی دەولەتی عیراق. سلێمانی نموونەیە بۆ شارەکانی تر، بوونی ژێدەرو سەرچاوەو زۆریی ڕووداوەکان، دەوریان لەهەلبژاردنی پایتەختی میرنیشینی باباندا بینیوە ، بۆ بابەتی لێکۆلینەوە.

نەبوونی دامەزراوی ئەکادیمیی تایبەت بۆ لێکۆلینەوەی سۆسیۆلۆگیو نەبوونی پشتگیری، زیانی لەکاری سیاسیش داوە، نەك تەنیا بلاوکردنەوەی نووسین لەسەر ئەم خالە گرنگەو تێگەیشتنی سیاسیی بۆ دەوری هێزە کۆمەلایەتییەکانی لاواز کردووەو بیری سیاسیی هاویشتووەتە گەرووی خولانەوە لەبازنەی بەتالدا، دەمەوێ ئەوەش لەیاد نەکەم، کە ئەم کارە بۆ خوێنەری ڕۆژئاواییو بۆ مەبەستێکی زانستی نووسراوە، وەکو بەشێك لەکارێکی گەورە، بۆ ڕوونکردنەوەی بارودۆخی ئەمڕۆ، لەبەر ڕووناکیی پەرەسەندنی کۆمەلو بەرەو پێشەوە چوونیدا تەرخان کراوە.

لەهەندێ برگەی سەردەمێکی مێژووییدا، ئەم گروپە کۆمەڵایەتییانە بەگشتی یەك هەڵوێستیان هەبووەو مۆرکی خۆیان بەڕووداوەکانەوە ناوە، بۆیە نووسەران وەکو یەکەیەکی کۆمەڵایەتی سەرنجیان داوەتێ.

لەزمانەکانی عەرەبی، کوردیو فارسیدا، هیچ چەمکێکی زانستیی گونجاو بۆ بۆرجوازی نەدۆزراوەتەوە، هەرچەندە دەستەواژەیەکی گشتی هەبووە وەکو (مەلیكو رەعیەت)، کە (رەعیەت) دانیشتوانی مەمملەکەت (مملكة) بوون، بەبێ جیاوازی لەنێوان شاریو لادێیو بازرگانو پیشەگەر، لەهەمان کاتدا (ئاغاو مسکێن) هەبوون. ئێستا (مواطن)، (هاووڵاتی) جێگەی (رەعیەت)ی گرتووەتەوە، هەرچەندە دەسەڵاتداران مافی هاووڵاتیبوونیان بەکردەوە نەسەلماندووەو مافی هەڵبژاردنو بەشداریکردنیان لەژیانی سیاسیدا لێ زەوتکراوە. دیارە مافو ئەرکی (مواطن) و(رعية) جیاوازەو نابێ لەڕووی یاساییو سیاسییەوە جێگۆڕکێیان پێ بکرێت. بۆماوەو میراتی فەر هەنگی سەدان ساڵ لەمەوپێش وەکو شاخەبەفر بەجارێ ناتوێتەوە، گەر زەمینەی ئابووریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی بۆ خۆش نەکرێت.

مەبەست لەچینی بۆرجوازی ئەو بازرگانو پیشەگەرو سەنعەتکارو کاسبکارو دوکاندارو فەرمانبەرانەن، کە دانیشتووی شاربوونو لەژیانو هەڵسوکەوتو بیرکردنەوەدا لەگەڵ چینی فەرمانڕەوادا جیاواز بوون. توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵو میرومیرزادەکان بەچاوی زۆر سووك سەیری کاسبکارانیان کردووە و هەمیشە لەبن چەوسانەوەدا بوون[٢]، ئەم چینە کۆمەڵایەتییە، خاوەن هێزو توانای ئابووریو سیاسیو فەرهەنگیی خۆی بووە. سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، سەرەتای هەستکردنە بەبوونو جوڵانەوەی ئەم چینە. هیچ مانیفێستو بەڵگەی ڕاستەوخۆ لەنوێنەرانی ئەم چینەمان بەدەستەوە نییە، بەڵام ئاماژەکردنو نیشانەو شەقڵی تایبەت لەسەر جووڵانەوەو دەربڕینی هەڵوێستیان هەیە. ئێمە نموونەکان دەستنیشان دەکەین، کە دەلالەتی مێژوویی خۆیان هەیەو لەبەرچاویان دەگرین.

چینی بۆرجوازی لەوڵاتە ئۆروپیەکاندا، ئاڵاهەڵگری یەکگرتنەوەی نەتەوەییو هەڵتەکاندنی دەسەڵاتی پاشایەتیو دەرەبەگایەتی بووەو دەسەڵاتی گرتووەتە دەست بۆ نموونە(شۆڕشی فەرەنسا) لەوڵاتی تری وەك ئەڵەمانیادا ـ بۆ نموونە ـ ئەم چینە بەهۆی لاوازیی ئابووریو فەرهەنگیو سیاسییەوە، نەیتوانیوە بەشۆڕشو راپەڕینی چەکدار دەسەڵات بگرێتە دەستو دەسەڵاتی مەلیكو کایزەرو (Kaiser) میرو دەرەبەگەکان هەڵوەشێنێتەوە. هەر دوابەدوای سەرنەکەوتنی شۆڕشی بۆرجوازی دیموکراتی لە ئەڵمانیا ساڵی ١٨٤٨، کە دەیەویست وەکو شۆڕشی فەرەنسی، ڕژێمی کۆن بەرژێمێکی بۆرجوازی بگۆڕێو یەکگرتنەوەی نەتەوەیی بهێنێتەدی، هێزە بۆرجوازییەکان تووشی تێکشکانو ژێرکەوتنو پەرتەوازەیی و لاوازی بوون.

ئاڵای شۆڕشی کۆمەڵایەتی نەوی کراو ئاڵای سازشو سازشکاری لەگەڵ هێزە کۆنەپارێزەکاندا بەرزکرایەوە. هێزە کۆنە پارێزەکانیش بۆیان نەدەلوا وەکو جاری جاران فەرمانڕەوایی خۆیان بکەن، بەبێ گۆڕانی ئایدۆلۆجیاو سیستمی کۆمەڵایەتیو سیاسیی کۆن. لەماوەیەکی زۆر کورتدا، لەسەنگەری دوژمنایەتی یەکگرتنەوەی نەتەوەییەوە، گواستیانەوە بۆ سەنگەری بزووتنەوەی یەکگرتنەوەی نەتەوەیی. ئۆتۆفۆن بسمارك، کەمیرێکی بچووکی، کەم دەسەڵات و گومناوی رۆژهەڵاتی پرۆیسیا بوو، لەچاو بنەماڵەی مەزنی هابسبۆرگ ـ نەمسا ـ بەهۆی یەکێك لەرووبەڕووبوونەوەی چەکدارانەیان دژی هێزەکانی شۆڕش لەبەرلیندا، ناوبانگی دەرکرد. پاش سەرکوتکردنی شۆڕش بووە ئاڵاهەڵگری یەکخستنەوەی ئەڵەمانیا. میرنشینو مەملەکەتو دەوڵەتۆکەو دەوڵەت شار (Stadtstaat)ی بەلوولەی تفەنگ یان بەڕەزامەندی لەنێو پرۆژەی یەك دەوڵەتی نەتەوەیی توێنرانەوە[٢]. ئەڵەمانەکان ئەمڕۆش ئەو پرسیارە دەکەن: کە ئەڵەمانیا پرۆیسیای قووتدا، یان پرۆیسیا ئەڵەمانیای قووتدا؟

* * *

## ((طبقەی خواص)) و ((طبقەی عوام))

من زۆرم لا مەبەست بوو نووسینێك بدۆزمەوە كە بۆچوونو تێڕوانینی كەسانێكی تێدا بێت، لەنێوان ساڵانی (١٨٢٠ ـ ١٩٢٠) ژیابنو لەسەر تێگەیشتنی ئەوان بۆ چینو ریزبەندی چینایەتی شتێك نووسرابێت یان شتێكیان نووسیبێت. وتارێكی (ئەحمەدی عەزیز ئاغا)م بەرچاو كەوت لەژێر ناونیشانی ((طبقەی خواص))و ((طبقەی عوام)) كە لەساڵی ١٩٢٦ لەرۆژنامەی ((ژیان)) بڵاوكراوەتەوە. نووسەر كاتی نووسینی بابەتەكەی تەمەنی (٣٢) ساڵ بووە، واتە: لەچارەكی چوارەمی ئەو سەد ساڵەدا ژیاوە. ئەو، كۆمەڵ لەرووی چینایەتییەوە، دەكاتە دوو گروپی سەرەكییەوە: ((خواص)) یان ((خەواس))، واتە: هەڵبژاردەی كۆمەڵ: زانا، ئەشراف، بازرگان، خاوەن موڵكو رووناكبیران. ئەوەی دەمێنێتەوە دەیانخاتە ریزی ((عوام))، واتە: جووتیارو پاڵەو كرێكارو پیشەوەرو وردەواڵە فرۆشو كاسبی بچووك، دەچنە خانەی ((عوام))ەوە. نووسەر پێیوابووە چینی ((خەواس)) یان ((تایبەت)) دەتوانێ دەوری بزوێنەر لەكۆمەڵدا بگێڕێتو بەرەو گەشەكردنو پێشكەوتنی بەرێت. ئەو بەپێچەوانەی بۆچوونی ئێمەوە پێیوابووە: ئەم دوو ((چینە)) ناكۆكو دژی یەكترن. ئەو دەنووسێت: ((هەردوولا بەچاوێكی بێگانەییو نەفرەتەوە تەماشای یەكتریان كردووە)). كەواتە: ئەوە هەموو بەڵگەیە لەسەر ریزبەندی چینایەتی پێش هەرەسهێنانی میرنشینی بابانو پاش هەرەسهێنان ١٨٥١ز راست نیین. ئەمە تێڕوانینێكەو رەنگە بۆ ساڵانی ١٩٢٦ بەدواوە جۆرێك تێگەیشتن بێت بۆ لێكدانەوەی دابەشبوونی ستوونی كۆمەڵ بۆ چینو توێژی جیا جیا. باشتر وایە دەقەكەی نووسەر پاش گۆڕینی بۆ سەر رێنووسی ئەم سەردەمە، سەرلەنوێ بخوێنرێتەوە، هەر بۆئەوەی خوێنەری ئازیز خۆی ئاشنایەتی لەگەڵ شێوازی بیركردنەوەی ئەو كاتەدا پەیدا بكات:

ئـەمڕۆ، هـەموو میللـەتێکی سـەر ئـەرز بـۆ ئـەوەی هەریەکـە لەرێیەکـەوە ئیستراحەتی خۆیان تەئمین بکەن تەبەقە (طبقة) تەبەقە جیابونەوە هەریـەکی ناوێکیان لەخۆیان ناوە، وەکو عولەما، ئەشراف، توجار، موتەحەییزان، منەوەران، ئەمانە تەبەقەی (خواص)و سائیری کە عەوامن. ئینجا بزانین ئەمانە وەزیفـەیان چییە؟ بۆ یەکتری ئەبێ چی بکەن؟

تەبەقـەی خـەواس: چـونکە قیـسمێکی تایبـەتین‌و تەئـسیریان هەیـە لـەناو تەبەقـەی عـەواما ویجدانـەن مەسئول‌و موکەلـەفن کـە هـەر فـەردێك بەقـەدەر تواناى خـۆی سـەعی بـۆ پێشکەوتن‌و سـەرکەوتنی قـەومی خـۆی بکاو بەهـەموو نەوع فیداکاری مەعاونەت‌و ئینسانیەت موکەلەفن، یـەعنی وەزیفـەیان عیبارەتـە لـەبیناکردن مەکتـەب، کۆکردنـەوە ئیعانـە بـۆ مـەعاریف‌و فوقـەرای میللـەت، تەشکیل کردن دەستگاە، سەنعەت، تەبەروع کردنـی کتێـب، ئیرشاد میللەت، بـۆ ئمور خەیرییە ئیکمال نەواقیس ئومەت‌و تەشەبوس (تـشبث) کـردن بـۆ رەفاە و سـەعادەتی مەملەکـەت‌و دیـسان ئەبــێ لەگـەڵ تەبەقـەی عەوامـدا شـەفەقەتێکی باوکانە بنوێنن‌و هەموو زەحمەت‌و مەشەقەتێکیان بۆ ئختیار بکەن.

تەبەقـەی عـەوامیش، موکەلەفـە بەئیتاعـەتێکی جـدی‌و ئەولادانـەو هـەموو وەختـێ وەکو سیلاحی دەسـتی تایبـەتی حـازرو ئامادەبـێ بەئیتاعـەت‌و فـەرمان برادەری‌و بەبـێ ئیعتیراز بـە کامـل فـەخرەوە بـۆ ئـەمری خـەیر بـچوکیان قبـوڵ بکەن.

ئــەنجام بــەم تەرحــە میللــەتان تــر مەیــدان بــەهیچ فەلاکـەتێك نــادەن‌و موتەحیدەن بۆ ئامال یەکتری هەوڵ ئەدەن، گەورەکان تەدبیر مەعقول‌و مـەقبول رێکئەخەن بچوکەکان تەعقیب‌و ئیجرای ئەکەن.

بـەڵام داخـی بەجـەرگم چـونکە ئـەم تەقسیم وەزائیفـە تـا ئێـستا لای ئێمـە نــەبووە، ڕۆژ بــەڕۆژ تەســبیحات فەلاکــەتمان کــردووە، ســەعات بــە ســەعات

دوواکەوتوین، هەڵخلیسکاوین نە گەورە بەزمیی بەبچوکا هاتۆتەوەو فیداکاری بۆ ئیستراحەتی کردوەو موحیبەت خۆی پیشان داوەو نەبچوك ئیتاعەتو مەربوتیەتی بەرامبەر بەو گەورەیە نواندووە.

هەردوولا بەچاوێکی بێگانەیی‌و نەفرەتەوە تەماشای یەکتریان کردووە، کەس ئەمنیەتی نەکردووە دەردە دڵ خۆی لای کەس بکاتەوە چونکە موخاتەبەکەی لەجیاتی دەرمان دۆزینەوە توشی تەنگو چەڵەمەی کردووەو هەر لەم ڕووەوە بۆ چەند تاقمی وەکو مەڕ قوربانی سەوقی ئەشکەوتو بڕینی دار فەلاقەکرانو هاوارو فیغانیان عەرشی عەزیمی کەڕ کرد، کەچی تەبەقە عەوام ((تایبەتی)) دەستیان ئەدا بەپشتی ملیانا (احسنت، احسنت)یان ئەوت.

ودیسانەوە هەر بەم واستەیەوە بۆ چەند میقدارێ لەقسم تایبەتی تەحقیرو تەجریم کران عەوام پێیان پێئەکەنین ئاواتیان ئەخواست.

بەسورەتێکی (صورتێکی) وا لەیەکتری جوێ بوینەوە تابوین بە بەرەی خۆخۆر، بوین بە ئالەت جینایەت لەحەق یەکتری‌و وتویانە (تەجاوزکردن فەردێك، حەقارەتە بۆ عموم) ئەگەر ئێمەش ئەوڵ ڕۆژ تەجاوزی فەردێکمان قبوڵ نەکردایە عمومەن موحەقەر نەدەبوین، ئەگەر ڕۆژی خۆی گەورەیەك لەسەر بچوکێكو، بچوکێك لەسەر گەورەیەك بهاتایەتە جواب ئەم پاشکەوتنو نزمییەمان بە خۆمانەوە نە ئەدی.

ئەمەی کە دیمان ئینتیباهێکی تاریخی بوو نابێ قەت لەبیرمان بچێتەوە. خولاسەی کەلام، ئەگەر هەموو فەردێکی میللەت وەزیفەی خۆی زانی‌و لەپاش زانین بەتەواوی بەجێی هێنا، دائیمەن سەرئەکەوێو هەموو ئانێك بەرەو تەرەقی ئەڕوات ئەگینا نەء.

**من انچه شرط بلاغست باتومیگویم**

**توخواهی ازسخنم پندکیرو خواهی ملال**[٤]

## شاری سلێمانی و بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی

بۆرجوازی کورد، وەکو هێزێکی سیاسیی سەربەخۆ، ئالآی سەربەخۆیی نەتەوەیی بەرزنەکردووەتەوەو لەسەر شانۆی رووداوە سیاسییەکاندا دەوری سەرەکیی نەبینیوەو خۆی خزاندووەتە پەراوێزی ڕووداوە مێژووییەکانەوە. ڕەنگە یەکێك بوێرێ باسی کولتوری دەرەبەگایەتی، یان کولتوری عەشیرەتگەری بکات، بەڵام باسکردنی کولتوری بۆرجوازی هێشتا نەختێك زووە. دیارە من نکۆڵی لەبوونی (کولتوری شاری)، بەرامبەر کولتوری گوندنشینی و کلتوری کۆچەرایەتی، ناکەم. ئەوە ڕاستییەکەو سیّ و چوار کردن هەڵناگرێ. کولتوری شاری، کولتورێکی گشتییەو پشکی ئۆروستۆکراتی خێڵەکی و توێژی بنەماڵەی شێخزادەو زانایانی ئایینی دەستڕۆیشتوو، کرێکارو زەحمەتکێشانی پێوەیەو هەروا بەئاسانی سنووریان بۆ دانانرێ.

دروستبوونی کولتوری بۆرجوازی، یان دروستبوونی بەکاڵی و کەم ڕەنگیی، نیشانەی لاوازیی ئابووریی ئەو چینەیە:

ئایا ئەم دیاردەیە بەڵگەیە لەسەر بێ هێزی و لاوازیی ئابووریی ئەم چینە یان میکانیزمی داگیرکراوی ئەم چینەی لەڕووی ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەوە کردووەتە پاشکۆ یان پاشکۆی پاشکۆ؟

داگیرکراوی پەیوەندیی پاشکۆبوونی هێناوەتە بەرهەم یان لاوازیی ئابووریی چینی بۆرجوازی، بۆ دەستکەلاو ئامرازو داردەست و پاشکۆی چینی بۆرجوازی داگیرکەر لەقاڵب داوە؟

جێگەی خۆیەتی ڕووناکبیرو کۆمەڵناس و مێژوونووسانی کورد بیر لەو پرسیارەش بکەنەوە:

بۆ شاری سلێمانی بووە بەناوەندی جووڵانەوەی نەتەوایەتی لەکوردستانی عیراقداو شارەکانی تر ئەم شەقڵەیان پێوە دیار نییە؟

زۆربەی رووناکبیران پێیان وایە: ترادسیۆن (Tradition)و کولتوری میرنشینی بابان، کاریگەری خۆی هەبووە، لەگەڵاڵە بوونی هەستی نەتەوایەتیدا. ئەگەر ئەم بۆچوونە راست بێتو لەسەر داروبەردی داڕووخاوی میرنشین، بزووتنەوەی نەتەوەیی لەدایك بووبێت، بۆ هەمان دیاردە لەشاری راوەندوز، کە پایتەختی میرنشینی سۆران بووە، بیری بزوتنەوەی نەتەوەیی لەوێش سەری هەڵنەداوە؟

تۆ بڵێی: گەورەیی‌و بچوکیی شارو بەهێزبوونی بزافی تەریقەتی قادری، هۆیەکی گرنگ نەبووبێت یان پەرەسەندنی بیری نەتەوەیی یەکێکیان رێگە خۆشکەر نەبێت بۆ دروستبوونی بزافێکی نەتەوەیی؟

ئەگەر گەورەیی‌و بچووکیی شار دەوری بینیبایە لەسەرهەڵدانی جووڵانەوەی نەتەوەییدا، دەبوو لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتو باکووریشدا هەمان دیاردە بەرچاو بکەوتایە، بۆ شارێکی چکۆلانەی وەکو سابلاخ (مەهاباد)، کە سەردەمێك پایتەختی میرنشینی موکریان بووە، دەبێتە ناوەندی جوڵانەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی، کەچی شارێکی گەورەتری وەکو سنە (کوردستان)، کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ پایتەختی والییەکانی ئەردەڵان بووە، ناتوانێ خەرمانەی بیری نەتەوەیی لەخۆی بئاڵێنێ؟

تۆ بڵێی، پەیوەندیی خزمایەتی‌و مەزهەبی، بەشێك لەئەرۆستۆکراتەکانی ئەردەڵان بەبنەماڵەی شاکانی قاجارەوە، بیری نەتەوەیی تاڕادەیەك خەفە نەکردبێت یان کاریگەری گۆرانکاری دەرەکی (هاتنی سوپای سۆڤێت) ئاگری بزافی نەتەوەیی خۆش نەکردبێت؟

ئەمانە هەموو پرسیارن و لەبەردەم ڕووناکبیراندا قووت دەبنەوەو پێویست بەوە دەکات، نەوەی ئەمڕۆ کاریان لەسەر بکاتو هەروا بەفەرامۆشکراوی بۆ نەوەی داهاتوو بەجێیان نەهێڵێ.

من بۆ ئەم نووسینە، بەڵگەو فاکتی زۆر کەمم بەدەستەوەیەو هەندێ لەو بەڵگانە، دەستم پێیان ڕاناگات، لەبەر دووریو پشت گوێخراوی ـ بەڵگە عوسمانییەکانو ئەو بەڵگەو دۆکۆمێنتانەی کە لەبەغدان. پێش ئەم نووسینە، کەس ڕاستەوخۆ هەوڵی لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم بابەتە نەداوە، هەروەکو دەڵێن: (**مشتێك نمونەی خەروارێکە** ) ئەم نوسینەش مشتێکە لەخەرواری مێژووی بابەتەکەو مەبەست تەنیا پێشکەشکردنی بۆچوونێکە، نەك لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی فراوان، کە بەداخەوە لەهەموو ڕوویەکەوە سەرووی توانای بەندەیە.

## ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

چوارچێوەی هەلومەرجی سەرهەڵدانو گەشەکردنو شێوەگرتنو خۆدارشتنی چینی بۆرجوازیی ڕۆژهەڵاتی، لەزۆر گۆشەنیگاوە لەگەڵ چینی بۆرجوازی ڕۆژئاواییدا جیاوازە. هەردوولا، خاڵو شەقڵی ناوکۆیی یەکانگیرو هاوبەشیان هەیە. ئەو ماکانەی شاری پێ پێناسە دەکرێ وەکو: (دامەزراندنی بازاڕ، خانووی بەچڕی لە تەنیشت یەکتر دروستکراو، کاری بازرگانی - بەگشتی - نان پەیداکردن.. هتد)[٥]، بەڵام لەڕۆژهەڵاتدا مەرجێکی گرنگ بزرە، کە بریتییە لەرەزامەندیی دەربڕینو بەڵێنی پارێزگاری میرو دەرەبەگە مەزنەکان بۆ دانیشتوانی شار. بەگوێرەی ڕێکەوتننامەی گەورەمیران لەلایەکەوە، کاڵای دوورە وڵاتان بەبەردەوامی دەڕژێتە بازاڕەوە، لەلایەکی ترەوە داهاتی ساڵانەی ئەو بەگومرگو سەرانەو بازاڕانەو باجی پاراستن، فرەتر دەبێ[٦].

ئەوەش لەڕۆژهەڵاتدا بەدی دەکرێ ئەوەیە مەرج نییە پیشەگەرو بازرگانو کاسبکاران لەیەك بەرو یەك نەتەوەدا بن، بەڵکو ئەوان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئەو بەشەیان لە (رەعیەت) بە (بییانی) داناونو هەر زۆر بەسووك سەیریان کردوونو باجی قورسیان لەسەر داناونو کاری ئەوانیان بە (عەیب) داناوە[٧] ریچ ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کاتێك لە سلێمانی دەبێتو هەواڵی خالید پاشا لەعەبدوڵڵا پاشا دەپرسێو ئەویش دەڵێ: ((هێندە لەبەغدا ماوەتەوە هیچ سیفەتی عەشایەری تێدا نەماوەو ڕەنگی بازرگانی لێ نیشتووە، کە بەئینگلیزییەکەی وەهایە:

((He has been so long in Baghdad that he has lost all traces of clanship, he has become no better than a merchant))[٨]

(وشەی بازرگانو کاسبکار لای چینی ئۆرستۆکراتیی بابان گەورەترین جوێنو سوکایەتی بووە).

هەرچەندە کاری پیشەیی لەگەشەکردنو پەرەسەندندا بوو، بەڵام شاری ڕۆژهەڵاتی تا سەرەتای سەدەی بیستەم، خۆی لەتۆیپۆسی (Typus) شاری شارنشینی کشتوکاڵی ـ شاری بۆرجوازی جوتیاری نەترازاندووە. ئەم دیاردەیە دژی شێوەی بەرهەمهێنانو پەیوەندیی کۆمەڵایەتی ڕۆژئاواییە، شارییەکان بەرەبەرە بەخەبات مافی خۆیان وەدەستهێناوەو سەپاندووە و پارێزگارییان مسۆگەر کراوە. شاری ڕۆژهەڵاتی، لەبن قەمچیی سێبەری بازنەی دەسەڵاتی خێڵە کۆچەریەکاندا بووە، جارجار باش لە یەك تێنەگەیشتن، یان پێویستیی ژیان، بەمەبەستی پارێزگاریو ڕێز لە یەکگرتنو دەستدرێژ نەکردن بۆ سەر مافی یەکتر هەرەسی پێ هێنراوەو شار لەلایەن هێزە کۆچەرییەکانەوە پەلاماردراوەو شارنشینان بەر ڕەحمەتی هاوپەیمانەکانی کەوتوون. هەروەکو پاشان ڕوونتر دەکرێتەوە: بۆرجوازی لەبەردەم دووڕێیانێکدا بووە و ڕێگەی سێیەم لەهاوکێشەی هەڵبژاردندا دەرهاوێژراوە، یان ئەوان دەبا خۆیان لەبن ڕەشماڵی دەسەڵاتی سەرۆك هۆزێك بهاونو سەری خۆیان بقەبڵێننو ئاگرە سوورەی تاڵانو پەلامارو تووڕەیی خێڵە کۆچەرەکان لەخۆیان دوورخەنەوە، یان بۆ خۆپاراستن پەنا بۆ دیوەخانی دەسەڵاتی دەرەبەگی مەزن بەرنو سەلامەتیی کاروانو ژیانی خۆیان مسۆگەر بکەن. ئەم پەیوەندییە ناهاوسەنگەی نێوان شارو دەوروبەر، نێوان دەسەڵاتی ڕەسمیو نهێنی، کە زۆر جەورو ستەمی تێدابووەو پابەندی هیچ دەستوورو یاسایەك نەبووە، مایەی گەشەنەکردنی شارو تێکشکانی پرۆژەی ڕزگاری بۆرجوازی ڕۆژهەڵاتییە، کە تا ئەمرۆش باڵا دەستو سەرفراز نییەو لەسەدان لاوە ڕزگاریو سەربەستیی ئابوریو سیاسیی پێشێل کراوە. هەر ئەم هۆیانەش ڕێگری دەستپێکردنو گەشەکردنی ژیانی پیشەسازی بوون. بەهۆی

نەبوونی (ماڤ شار)ەوە، کە لەڕۆژئاوادا بەخەباتی زۆر سەخت بەدیهێنراوە، ئازادیو سەربەستی تاکە کەسیش لەرۆژهەلاتدا نەیتوانیوە جێگەی خۆی بکاتەوەو وەکو دوورگەی سەربەستی لێ بێتو زوڵم لێکراوان پەنای بۆ بەرن، وەکو لەکۆندا ئەم گوتەیە لەڕۆژئاوادا باوبووە (هەوای شارئازادو سەرفراز دەکات) (Stadtluft macht frei)[٩] ئەم جۆرە پەیوەندییە لەنێوان دەسەلاتدارو بن دەسەلاتدا، لەنێوان فەرمانڕەواو بن دەستدا، تەنانەت ڕێگەی بەپەیدابوونی دامەزراوەی ئەوتۆ نەداوە تا نوێنەری بەرژەوەندی مرۆڤی شاری بێت و ئازادی و سەربەستیش ڕەوانەی تاراوگە کراوە.

لەکوردستاندا شاری ئەوتۆ هەن، کە ڕەگو ڕیشەیان دەگاتە سەدە کۆنە نەزانراوەکانی مێژوو (وەك کەرکوك، هەولێر، خانەقی، کۆیە، کفری، ئامێدی...)کە هەر زۆر کۆنن. ئەم شارانەی لەکوردستانی عیراقدا بواری نوێبوونەوەو گەشەکردنیان نەدراوەو تا سەرەتای سەدەی پێشووش لەبن باری قورسی دیرۆکی خۆیاندا نالاندوویانەو بەهەزار داو ڕێگەی ئەوەیان لێ گیرابوو، کە ببنە ناوەندی شارستانی مۆدێرن. نەبوونی دەوڵەتی کوردی، دەوری خۆی بینیوە، لەسەقامگیرکردنی میکانیزمی پاشکەوتنو بەجێماندا. دامەزراوەی دەوڵەتی، بۆی هەیە دەوری هاندەرو پشتگیر بگێڕێ. نەبوونی داوودەزگای دەوڵەتی دەتوانێ، وەکو وێرانبوونی ئەو شارانە شاهیدبن، پەرەسەندن بەرەو دواوە بگەڕێتەوەو پێشکەوتن بەپاشکەوتن بگۆڕدرێت. کارەساتی هەڵەبجە، بەڵگەی وێران کردنو شێواندنو دڕندایەتی داگیرکەر دەسەلمێنێ. داگیرکەر نیوەی ئەوەی لەپرۆسەی کاولکردندا بەکاری هێناوە، بۆ پرۆژەی بیناو دامەزراندنو دروستکردن بەکاربهێنایە، هەڵەبجەش وەکو هەموو شارێك بەگوڵ خۆی دەڕازاندەوە. نەبوونی داموودەزگای دەوڵەتی، زیانێکی گەورەی لەژیانی شاران داوە. تەختکردنو ڕاگواستنی چوارهەزارو پێنجسەد گوندی دڵڕفێن ئەوە

هەر باسیان ناکەم. لەکۆنیشدا هەر وابووەو لەئەمڕۆشدا - لەپێش ساڵی ١٩٩١ - باشتر نەبووە، داگیرکەر وەکو داگیرکەر هەڵسوکەوتی کردووەو تەنیا باج‌و سەرانەو راوڕووتی خۆی مسۆگەر کردووە. هێزەکۆچەرەکانیش، بەشێکیان لەسەدەی نۆزدەهەم بۆ خوارەوە، کەجۆرێك پەیوەندی‌و هاریکاریان لەگەڵ داگیرکەراندا هەبووە، بەئارەزووی خۆیان کوشتوبڕیان کردووە، باجیان داناوە، سەرانەیان سەندووەو کەس نەیوێراوە بەرامبەریان بوەستێتەوە. ئەم خۆسەپاندنەی خێڵ‌و هۆزە گەورەکان تەنیا سەپاندنی دەسەڵاتی ئابووری‌و سیاسیی ئەوانی وەکو هێزێکی باڵا دەست سەلماندووە. ئەم دەسەڵاتە، سێبەری خۆی هاویشتووەتە سەر شارەکانیشەوە، تەنانەت بیروباوەڕی کۆچەری‌و نەریت‌و شێوەی هەڵسوکەوتی ئەوان لەناو چەقی شارە گەورەکانیشدا زاڵبووە. شاری وەکو (شاری) هەڵسوکەوتی نەکردووەو بیری نەکردووەتەوە، بەڵکو وەکو کابرایەکی کۆچەری یان خێڵەکی، با ئەو کەسانە لەژیانی ڕۆژانەشدا گرێدراوی شێوەی بەرهەمهێنانی بۆرجوازیش بووبن.

شارییەکان، قوربانی تاڵانکردن‌و چەوسانەوەو تەنگ پێ هەڵچنین بوون. لەسنوری چەندایەتیشەوە، ژمارەیان خۆی خواردووەتەوە، هەر بۆ نموونە ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی، لەساڵی ١٨٢٠دا بەنزیکەی دە هەزار (١٠٠٠٠) کەس دادەنرێت. سەیر دەکەین، پاش سەد ساڵ واتە: ١٩٢٠ ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی وەکو خۆی ماوەتەوەو بۆتە (١٠٠٠٠) کەس سەرلەنوێ[١٠]. شارە کوردنشینەکان لەم سەردەمەدا لەچاو شارە گەورەکانی عیراقدا بچوك بوون. شاری کەرکوك، ژمارەی دانیشتوانی (٢٥٠٠٠) کەس بووەو شاری هەولێر (١٥٠٠٠) کەس بووە. ئێمە ئەگەر ئەم سێ شارە لەگەڵ سێ شاری عیراقدا لەساڵی ١٩٢٠دا بەراورد بکەین، دەبینین: ژمارەی دانیشتوانی شاری بەغداد (٢٠٠٠٠٠) کەس بووە،

شاری موصل (٧٠٠٠٠) کەس بووەو ژمارەی دانیشتوانی بەسرەش (٥٥٠٠٠) کەس بووە[١١].

دیارە هۆیەکیتری گەورە نەبوونی شارە کوردنشینەکان، دوورییانە لەڕێگەی ئاوریشمەوە(طریق الحریر). ئەم ڕێگەیە هەر لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە، بەکەناری کوردستاندا تێدەپەڕیو ناکەوێتە سەر ڕێگاکان:

* شاری ئیسکەندرۆنە، لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست.
* حەلەب دیار بەکر ـ موسڵ ـ بغداد ـ بەسرە ـ لەسەر کەنداو.
* بەحری قەزوین ـ زەنجان ـ تەورێز ـ ئەرزڕووم ـ دەریای ڕەش.

پەیوەندی شارە کوردەکان، بەڕێگەی ئاوریشمەوە بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

- هەولێر ← موسل
- راوەندووز ← بەغداد
- سلێمانی ← مەراغە ← تەورێز
- سلێمانی ← بەغداد
- سلێمانی ← تەورێز[١٢]

ئێمە لەئەدەبی گەڕیدەو گەشتکەرو مسیۆنارەکاندا بەرامبەر ووشەی کوردستان، چەمکی (جیهانی شاخ و کێو ـ World of mountains)مان بەرچاو دەکەوێ. لەئەوروپادا، خەڵك چاوی بڕیبووە کالای نایابی وەکو ئاوریشمو بەهارات، کە لەهیندو ئێراندا دەهاتنە بەرهەم. بەرهەمە کوردییەکان، تەنیا بۆ بازاڕی ناوچەیی دەیانتوانی کڕیار راکێشنو ئەو بەرهەمانە بۆ بازاری گەورەی جیهانی ئامادە نەدەکران. دەسەلاتدارانی مەزن، دەستیان بەسەر گرنگترین ناوەندی بازرگانیدا گرتبوو (تەورێزو مووسڵو بەغداو ئەرززرومو حەلەب) نموونەی ناوەندە بازرگانییەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بوون. ئەم دەسەلاتدارانە

دەیان توانی رێگەی هاتوچۆی کاروان بپارێزن‌و هەناردەو هاوردە (صادرات و واردات )ی ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ وڵاتە ئۆرپییەکاندا بەبێ تەگەرە بەرێوە ببەن. شەڕو شۆڕو گێرەو کێشەی نێوان ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانی، لەبنەمادا لەسەر ئاسایشی کاری بازرگانی‌و رێکەوتننامەی گومرگی‌و بەربەستی ئابووری بووە، نەك جەنگی ئاینیی‌و مەزهەبی.

هەروەکو دیوی دەرەوەی رووداوە خوێناوییەکان، ئەو تێگەیشتنە شێواوە بەبەشداران‌و بینەران دەبەخشن، کە جیاوازی مەزهەبی‌و ناکۆکیی بیروباوەڕ، بورکانی رق‌و کینەی تەقاندووەتەوە، هۆکارە ڕاستەقینەکان، لەبن هەوری ڕەشی پڕۆپاگەندەی راگەیاندنی مەزهەبیدا شاراونەتەوە[١٣]).

قەوارەی کاروان، نرخی کاڵا، مەودای هاتوچۆی کاروان، پێوەرن بۆ زانینی هێزی ئابووریی ناوچەیەك. بەراوردێك پێویستە لەنێوان کاروان‌و قەتاری کوردی‌و عەرەبی ـ عیراقی ـو فارسیدا[١٤]) قەوارەی کاروانی کوردی، لەچاو کاروانی عەربیدا هەر زۆر بچوکەو ڕێگەی کاروانیش بۆ ئاڵوگۆڕو کڕین‌و فرۆشتن، کورتە، تاڕادەیەکیش ناوچەییە. کاروانی عەرەبی ـ عیراق ـ پێکهاتبوو لەدوو هەزار بۆ سێ هەزار حوشتری بارکراو. کورد، ئەو زەمانە هێستری بۆ کاروان بەکارهێناوە. سەرەتای سەدەی پێشوو کاروانێك[١٥] بریتی بووە لە ٣٠-٤٠ هێسترو هەندێ جار ٨٠ هێستر وەکو ڕەحمەتی (ئەحمەد خواجە) بۆی گێڕامەوە[١٦].

سەردەمی میرنشینەکان، بازرگان‌و سەنعەتکارو پیشەگەرو کاسبکار، لەهەموو گروپە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر زوڵم و زۆریان لێ دەکرا. ئەوان لەڕووی ئایینی‌و نەتەوەییەوە جیاواز بوون: جوولەکە، عیسایی، فارس، عەرەب، ئازەر بوون[١٧].

ئەو زەمانەی (برایم پاشای بابان) دەیەوێ شاری سلێمانی دروست بکات، وەستاو سەنعەتکار لەشوێنی دوورەوە بانگ دەکات. سەنعەتکاری وەستای شارەزاو

فێربووی دەوێ، لەلایەکی ترەوە پیشەو کاری دەستی جێگەی نەفرەتو بێزلێ هاتنەوەی چینی سەرەوەی کۆچەرەکان بووە[18].

شەڕوشۆڕی بەردەوامی میرنشینەکان، لەگەڵ هێزە دەرەکیو ناوەکییەکاندا، هەلومەرجی دڵنیاییو ئارامی بەکاسبکاران نەدەبەخشی، تاپرۆژەی گەورە بگرنە ئەستۆو بازنەی کەسابەتەکەیان فراوانتر بکەن. خەزێنەی بەتاڵی میرەکان[19] ناچاری دەکردن باجو سەرانەی کاسبکاران زیاتر بکەنو هەمیشە پاڵەپەستۆو گوشاریان بخەنە سەر. شەڕ بەرپاکردنو درێژەپێدانی، پارەی دەوێ. ژیانو گوزەرانی دەرباری میرانیش داهاتێکی باشی دەوێ. کەس لەخۆوە، بەئارەزوو باجو سەرانە ناداتو کەس حەزی نەکردووە خۆی ماڵوێران بکات لەپێناوی بەختەوەریی میر، بۆیە زەبرو زەنگ بۆ پڕکردنەوەی خەزێنە بەکارهاتووەو کەلێن لەنێوان حاکمو حوکمکراودا دروست بووە.

## بـــاری ئـــابووریی ســـــلێمانی لـــەنیوەی یەکــــەمی سەدەی (١٩) دا

نووسـەرێکی ڕۆژاوایـی بیـەوێت لەسـەر (گوێتـە) یـان (شکسپیر) یـان هـەر کەسایەتییەکی ئـەدەبی یـان سیاسـیی لێکۆڵینـەوە بکـات، ڕەنگـە لەبـەر زۆری دۆکۆمێنـتو فاکتو بەڵگەنامـە لێتوێژینـەوەو لێپێچانەوە ئاسان نـەبێت. ئێمـە لەبەر نەبوونی زانیـاری، هیچمان پـێ نانووسـرێت. هـەروەکو چۆن لەناوەڕاستی هەشـتاکانی سـەدەی پێـشوودا بەشـێکی گونـدەکانی گـەرمیان ئـەنفالکرانو لەچـاوتـرووکاندنێکدا ژمارەیـەکی زۆر هـاووڵاتی بێتـاوان بێـسەرو شـوێن کـران، ئاوهاش بەڵگەنامەکانی شارەوانی، دادگا، ئیدارەی پارێزگا، تاپۆ، گومرگ ... هتد، لەسەرەتای هەشتاکانو لەکاتی ڕاپەڕیندا بەدەستی کاربەدەستانی ڕژێمو خـەڵکی نەزانو ناحاڵی لەناوبرانو کرانە خۆراکی ئاگر.

واتە: سەرچاوەی ڕەسەنو دەستی یەکـەم، ئـەوە دەسـتی لـێ بـشۆ. سەرچاوەو ژێدەری دەستی دووەمو سێیەم ئەوە لەگۆشەو کەناری هەندێ کتێبو بڵاوکراوەو زانیاریی پەرشو بڵاودا هەن، کە بەشێکیان هەر زۆر لەبابەتەکەوە دوورنو ئێمە ناچارین پەنا بۆ پووشو پەڵاشی قەراخ ئاو بـەرینو دەسـتیان پێـوە بگـرین. ئـەم زانیـاریو ئامـاژە نیـوەو نیوەچڵە، بەتـەنیا ڕەنگـە وێنەیـەکی لـێڵو ناتـەواومان بخەنە بەردەست، بەڵام بەخستنە پاڵ یەکتر وەکو یاری (پـووزل ـ Puzzl) بـەرە بەرە وێنەیەکی تۆزێ باشترمان دەست دەکەوێت.دکتۆر (محەمەد سەلمان حەسەن) ئاماژەیـەکی سـەرپێی بـۆ قـەوارەو ڕێـژەی دانیـشتوانی شـار لەکوردسـتاندا لەچاو کۆچەرو خەڵکی گوندنشین ساڵی ١٨٦٧ و ١٨٩٠ز کردووە، کە بۆ لێکۆڵینەوەی ئێمە سوودی خۆی هەیە:

## ڕێژەی دانیشتوانی کۆچەری ـ لادێیی ـ شاری ـ بەهەزار [٣٠]

١٨٦٧ و ١٨٩٠

| ساڵ | ناوچە | کۆچەری | ڕێژە ٪ | لادێیی | ڕێژە ٪ | شاری | ڕێژە ٪ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٨٦٧ | ناوچەی باکور | ٧٠ | ٢٦ | ١٤٠ | ٥٣ | ٥٥ | ٢٢ | ٢٦٥ |
| | ناوچەی ناوەڕاست | ١١٥ | ٢٣ | ١٧٠ | ٣٩ | ٤٦ | ٤١ | ٤٩١ |
| | ناوچەی باشور | ٢٦٠ | ٥٠ | ٢١٥ | ٤١ | ٤٩ | ٩ | ٥٢٤ |
| | عێراق | ٤٥ | ٣٥ | ٥٣٥ | ٤٠ | ٣١٠ | ٢٤ | ١,٢٨٠ |
| ١٨٩٠ | ناوچەی باکور | ٩٢ | ٢٣ | ٢٢٣ | ٥٥ | ٨٥ | ٢٢ | ٤٠١ |
| | ناوچەی ناوەڕاست | ٦٥ | ١٣ | ٣٤٠ | ٥٩ | ٢٧٠ | ٢٨ | ٦٧٥ |
| | ناوچەی باشور | ٢٧٥ | ٢٧ | ٤٠٠ | ٥٢ | ٧٥ | ١٠ | ٧٥٠ |
| | عێراق | ٤٣٣ | ٢٥ | ٩٦٣ | ٥ | ٤٣٠ | ٢٥ | ١,٨٢٦ |

بەگوێرەی ئەم خشتەیە بێت، ساڵی ١٨٦٧ز ژمارەی دانیشتوانی شاران تەنیا (٥٥٠٠٠) کەس بووەو (٢٢٪) کۆی دانیشتوانی کوردستان بووە. کۆی ژمارەی دانیشتوانی عیراق لەم ساڵەدا (١,٢٨٠,٠٠٠) کەس بووە.

ژمارەی دانیشتوانی شار، گەر هێندە کەم بووبێت، ئەوا بێگومان ناتوانێ دەوری گرنگ و بەرچاو لەڕووداوە سیاسییە چارەنووسسازەکاندا بگێڕێت. نابێ ئەوەشمان بیر بچێتەوە میرانی کورد پشتیان بەهێزی کۆچەرو گوندنشین بەستبوو، ئەوان هێزێکی (میلیشیا)ی چەکداری ئامادەبوون، کە دژی هێزی دەرەکی یان هەر هەڕەشەو پەلامارێکی چاوەڕوان نەکراو بجووڵێنەوە.

من پێمباشە کوردستانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم لەگەڵ یەکێک لەوڵاتەکانی ئەوروپا (ئەڵمانیا بۆ نموونە/ ساڵانی ١٦٠٠ز) بەراورد بکەم. ژمارەی دانیشتوانی ئەم وڵاتە (٢٤) ملیۆن کەس بووە، رووبەری ئەوێ رەنگە لەو کاتەدا هەرئەوەندەی رووبەری عیراق بووبێت. بیست هەزار (٢٠٠٠٠) شار لەوێ تۆمار کراوە، کە بەگوێرەی پێناسەی شاری ئەو زەمانە پێناسە بکرێت. لەوێش سێ لەسەر چواری دانیشتوان لەلادێدا ژیاون و (٢٥٪)یان لەشار ژیاون. لەوێ، ڕەنگە گەشەکردنی هێزی ئابووری بازرگان و پاشان شۆڕشی پیشەسازی دەوری لە پەراوێزی ئازادیەدا گێڕابێت، کە شار بەدەستی هێناوە[٢١]، ئەو زەمانە، هەر شارێك ژمارەی دانیشتوانی (٣٠٠٠) تەنها سێ هەزار کەس بووبێت، بەشاری گەورە دانراوە.

* * *

سەبارەت باری ئابووریی شاری سلێمانی، کۆمەڵێك بیروبۆچوونو ئاماژەی ناکۆك هەن. من پێم باشە تابلۆیەك لەبەرچاوی خوێنەر بێتو ئەو سەرپشك بێت، تا یەکێکی (تۆزێ) لەئێمە بەختەوەرتر بەدوای بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی کتێبخانەکانی لەندەنو بەغدا دەکەوێتو بەژمارەو فاکت ڕاستی دەسەلمێنێت:

دکتۆر (هەڵکەوت حەکیم) دەنووسێت:

بابانەکان بۆ ماوەیەك میرنشینی سۆرانیان داگیر کرد، بەشێك لەئەمارەتی ئەردەڵانیان هێنایە ژێر رکێفی خۆیانو چەند ساڵێکیش کەرکوكو هەولێریان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانو هەروەها بەسەر ئەمارەتی ئامێدیدا زاڵ بوون.

شان بەشانی پەرەسەندنی عەسکەری، هێزی ئابووریش پەرەی سەند، پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ شارەکانی تردا، وەکو: ئەستەموول، دیاربەکر، مووسڵ، کەرکوك، بەغدا، سنە، کرماشان ... هتد، هەتا دەهات فراوانتر دەبوو. هەندێ بەرهەمی کشتوکاڵی بابان لەوڵاتە عوسمانییەکاندا دەنگیان دابووەوە. ئەو میرانەی لەدەرەوەی کوردستان دەژیان ژیانێکی دەست بڵاویان بەسەر دەبرد، کە ناتوانین لەنیشانەی دەوڵەمەندی بەولاوە شتێکی دیکەی لێ تێ بگەین. بەڕای (کامپانیل)، کە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا سەری لەسلێمانی داوە، میرنشینی بابان لەو سەردەمەدا یەکێ لەدەوڵەمەندترین میرنشینەکانی کورد بووە[٢٢].

★ ★ ★

(فرایزەر) ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە: کاتێك سەرتیپ (محمد خان) بەخۆیو ٤٠٠ سەربازەوە لەسلێمانی بووە بۆ پشتیوانیی سلێمان پاشای بابان لەدژی (محمود پاشا)ی برای، داوای دووسەد تومەن لەپاشا دەکات کە نەهەیەتی بیداتێو نەبۆیشی پەیدا دەکرێت. دیارە پاشاکانی بابان لەڕووی دارایییەوە پەرێشان بوون.

سەرتیپ (محەمەد خان)، لەگەڵ قوەتێکی لەچوار صەد سەرباز کەمترو نەفەری تۆپچیو پێنج تۆپی جەبەل لەسلێمانی بوو. ئەم قوەتە، بۆ محافەزەی

(سلێمان پاشا) بەرامبەر بە (مەحموود پاشا)ی برای لێرە هێڵرابووەوە. لەدواییدا باسی فیشاڵو خۆهەڵکێشانی ئەم سەرتیپەی بە دوورو درێژی نووسیوە. (فرایزەر)، لەلایەکی تردا باسی فەقیریی (سلێمان پاشا) ئەکاو ئەڵێ سەرتیپ داوای دووصەد تومانی لێ کردبوو بۆ عەسکەرەکەی، بەڵام پاشا هەرچەند هەوڵیدا بۆی پەیا نەکرا[٢٣].

لەکاتێکدا ئەم تێبینیەی (فرایزەر) دەنووسمەوە، دەمەوێ سەرنجی خوێنەری ئازیز بۆ ڕایەکی پێچەوانەش ڕاکێشم، کە لەلایەن میرزادەیەکی بابانییەوە تۆمار کراوە:

(حاجی بەگ، لەماوەی دوومانگدا، حەفتا هەزار تمەنی دا بەپاشا. بابی نووسەریش پەنجا هەزار تمەنیدایە، پاشان داوای زامنی لێکردن، کە ئازادیان بکاتو بۆ هیچ کوێ رانەکەن. چوار کەس لەبازرگانانی وڵات بوونە دەستەبەر، کە ئەگەر ئەو دووکەسە لەفەرمانی پاشا بچنە دەرەوە، ئەوا ئەوان دە هەزار تمەن بدەن بەپاشا)[٢٤].

## چەند ڕوونکردنەوەیەك بۆ تێگەیشتنی تێکستەکە پێویستن:

❖ ئەم ڕووداوە ساڵی ١٢٤٩ ك بەرامبەر ١٨٣٣ ـ ١٨٣٤ ز لەزەمانی سلێمان پاشادا ڕوویداوە.

❖ ڕاپۆرتەکەی (فرایزەر)و گێڕانەوەکەی (عەبدولقادری بابان) باسی زەمانی یەك پاشا لەیەك ساڵدا دەکەن. یەکێکیان باسی نابووتیو ریسوایی پاشا دەکاتو ئەویکەیان باسی پاشایەك دەکات، کە توانای سزادانی قورسو سەرانە وەرگرتنو پارە پەیدا کردنی بەهەزاران هەیە.

❖ دەبێ ئەم دوو گێڕانەوەیە، یەکێکیان ڕاست نەبێ. رەنگە (سلێمان پاشا) پێی (ئەغز) بوو بێت، تەنانەت دوو سەد تمەنیش بکاتە دەست (سەرتیپ محمدخان). دووریش نییە کابرا هێندە بێ شەرمانە داوای پارەی کردبێتو پاشای بێزار کردبێت. ئەو (ئیحتمال)ەش دەمێنێتەوە، تا بەرپابوونی شەڕ لەماوەیەکی کورتدا، تەڕو وشکی سوتاندبێت.

ئەم بەراوردو بەراوردکارییە بۆ مێژوونووسان بەجێ دەمێنێ، ئەوەی بۆ ئەم نووسینە بایەخدارە ئەوەیەچوار (بازرگان) دەبنە زامنی دوو میری بابان یان دوو خزمی نزیکی پاشا، ئەم گێڕانەوەیە، بەڵگەی هێزو تواناو ڕەواجی بەڵێنی بازرگانەکانە. بازرگانەکان لەوە دەچێ لەمیرەکان زیاتر جێگەی متمانە بووبن، میری بابان، دەیتوانی داوای کەفیلێك بکات، سەر بەبنەماڵەی حاکم بێت یان ئەندامی ئەو بنەماڵەیە بێت. ئەوەی تۆزێ شارەزای مێژووی ئەم میرنشینە بێت دەزانێت: میرەکان توخمێکی پڕ بەمەترسیو سەر بەگۆبەن بوونو هەمیشە لەگەڵ ناوەندەکانی دەسەڵاتدا (بەغداو تارانو ئەستەمووڵو سنەو کرماشان) پەیوەندییان هەبووە. بەشێك لەمیرەکان هێزی چەکدار (میلیشیا)ی خۆیان هەبووە. ئەندامانی بنەماڵەی میر، هەندێ جار پشتیوانو پشتو پەنای میر

بوون، هەندێ جاریش سەرچاوەی مەترسیو پیلان بوونو پڕ زەرەر بوون بۆ چارەنووسی میرایەتی. هەمیشە سەرکەشوسەرچڵ بوونو ئامادە بوون بەچاو تروکاندنێك، لەبەرەی لایەنگرانو هاوسەنگەرانەوە بۆ بەرەی ئۆپۆزسیۆن جێگۆڕکێ بکەن. بازرگانەکان لەم هاوکێشەیەدا، بەرەی (بێپا) بوون، نەك بەرەی (پادار)، بەگوێرەی پەندە هەورامییەکە. ئەوان خاوەن بەرژەوەندیو کارو کەسابەت بوونو بایی ئەوە قورساییان هەبووە کە بەکەفالەت دوو میر لەزیندان بەرەڵلا بکەن. ئەوەی کە (ریچ)یش لەسەر دارایی میرانی بابان دەنووسێ. وێنەیەکی یەکجار جیاوازەو پێویستی بەلێکۆڵینەوەی تایبەت هەیە.

* * *

(محەمەد ئەمین زەکی بەگ) لەساڵنامەی عوسمانی ساڵی ١٣٠٧ی رۆمی (بەرامبەر ١٨٩٢ز) لیستی داهاتو دەرچووی (مصروفات)ی دەرهاویشتووە. لەم خشتەیەدا میزانیەی ساڵی (١٨٩٢ز) بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەداهاتی پارێزگای سلێمانی مەسرەفی ئیدارەیان داپۆشیووەو یەك ملیۆن قوروش ڕەوانەی خەزێنەی گشتی دەوڵەت کراوە. واتە: لەدەوڵەتەوە پشتگیری دارایی ڕەوانەی ئێرە نەکراوە، بەپێچەوانەوە، سەرەڕای خراپیو نالەباریی ئیداری، لێرەوە پارەی زیادە بۆ دەرەوەی سنووری پارێزگا ڕەوانە کراوە، لەکاتێکدا سلێمانی خۆی زۆر پێویستی بەداهاتی خۆی هەبووە.

((نەفسی شاری سلێمانی، مەرکەزی ئالای صەدەمینی رەدیفو ئالایەکی نظامیەی فرقەی سیو شەشەمینی کەرکوك بوو، طابووریەکی ضەعیفی ژاندەرمەشی بوو.

**میزانیـه (بوودجـه)ی لیـوای سـلێمانی لەسـاڵی ١٣٠٧ی رۆمیـدا لـەژێرەوە قەیـد کراوە:**

| وارداتی | غرۆش | مەصروفاتی | غرۆش |
|---|---|---|---|
| وێرگۆی ئەملاك و عەقار | ٨٠٤٧٧ | شەرعییە | ٥٠٢٠٩ |
| وێرگۆی تەمەتوع | ٩٣٩١٨٧ | داخلییە | ٣٢٧٢٨٨ |
| بەدەلی عەسکەری | ٢٦٥١١ | عەدلییە | ١٩٢٨٢٠ |
| رەسمی ئەغنام | ٧٥٧٨٧١ | مەعاریف | |
| بەدەلی عەشتار | ٦٥٤٠٦١ | نافیعە | |
| حاصیلاتی ئەعشار | ٢٧٨٥٠ | ئەورامان | ٢٠٠٠٠؟ |
| خەرجی ئەملاك و طاپۆ | ١٧٧٢٠٠ | مەعادن | |
| خەرجی مەحاکم | ١٥٠٢٥ | مالییە، ێرگوو | |
| وە مەعاشاتی زاتیە | ٢٥٨٥٠٦ | | |
| رسومی موتەنەویعە | ٥٢٢٥٠ | ضە بطییەو ژاندرمە | ٨٨٦٠١٤ |
| حاصیلاتی موتەفەریقە | ٥١٠٠٠ | صحییە | ٦٠٠ |
| مەجمووعی | ٢,٧٢٥,٦٣٧ | | ١,٧٠٦,٦٣٧ |

(ئەم ئەنجامـە بـەپێی لێکدانەوەکەی (محەمـەد ئـەمین زەکـی بـەگ)، کـە پـێ دەچێ هەڵـە بێـت، و ئەنجامـە راسـتەکان بـەم شـێوەیەن کـە مـەجموعی واردات ٢,٧٨١,٦٥٧ قروش، وە مەجموعی مەصروفات ١,٧٣٦,٦٣٧)قروشە.

تێبینی/ م.ج

عەینی ساڵنامە، بـۆ خـەدەماتی نافعـە (دروسـت کردنـی بینـاو ڕێگـەو پـرد)ی ولایەتی موصل ٢٠,٩٨٨ غرۆش، یەعنی تەقریبەن دووسەد لیرەی دانـاوە، لام وایـە ئەم پارە بەتەنیا مەعاشی باشی موهەندیسی موصل و معاونەکەی بوو.

مەصارفاتی سەنەوییەی مەعاریفی لیوای سلێمانی لە ١٣٠٧دا نزیکی صەدو پەنجا لیرەیەو ئەمەش بۆ مەعاشاتی مەعلمینی تەنیا مەکتەبێکی روشدیەی مولکیە بوو. باقی مەکتەبەکانی لیوا یا بەخێروخێراتی ئەهالی وە یا بەواسیطەی ئەوقافی خصوصیەوە ئەژیا. هەروەکو لەمیزانیەی لیوادا نیشانمان داوە. واریداتی لیوا کەم نەبووە لەمەصاریفی ١٠ هەزارو شتێکی زیاد بووە. بەڵام لەباتی بۆ ئاوەدانیو زانستی لیواکە صەرف بکرێ یا بۆ ئەستەموولٚ ئەنێرراو ئەچووە باخەڵی مەئمورین))دوە[٢٥].

هیچ زیانێکی نابێت ئەگەر ئێمە بزانین بەهای قروشێك لەسالانی ١٨٦٥ ـ ١٨٦٦ هەر ١١٠ قروش بەرامبەر (١) پاوەنی ئیستەرلینی یان (١) دینار بووە، ساڵی ١٨٩٠ بڕی (٣٠٠,٠٠٠) لیرەی عوسمانی بەرامبەر (١٨٠,٠٠٠) دینار بووە (تێکڕای نرخی سەرفکردن ٢٥ قروش بە (١) پاوەنی ئیستەرلینی یان بە (١) دینار گۆڕێنراوەتەوە[٢٦].

## سەرەتاکانی ڕۆڵی سیاسی چینی بۆرجوازی، لە شاری سلێمانیدا

لەسۆنگەی چەوسانەوەی بەردەوامدا، بۆرجوازی چاوی بڕیبووە ڕزگارکەرو فریادڕەسێك، لەدەرەوەی چینەکەی، خۆی تا دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکات، بۆئەوەی لەزوڵم‌و زۆری دەسەلاتداران سەرفرازی بکات. هەر بۆ نموونە، پێش ساڵی ١٨٢٠ (مەولانا خالید نەقشبەندی)، لەشاری سلێمانیدا دەرکەوت. (مەولانا خالید) (١٧٧٩ ـ ١٨٢٧) پیرێکی کارێزما بوو، بەدەرکەوتنی ئەو، پۆلپۆلێنێکی کۆمەلایەتیی توندوتیژ هاتەکایەوە[٢٧]. میرەکانی بابان‌و شێخ‌و مەلاکانی لایەنگیری (شێخ مارف نۆدێ)، کەپابەندی دۆگماتیزم بوون، بەرەیەکیان پێك دەهێنا، بەرەکەی تریش (مەولانا خالید)و موریدەکانی بوون، کە زۆربەیان بازرگان‌و کاسبکاری شاری بوون. دیارنییە لەو ژمارە (١٢٠٠٠) موریدەی مەولانا خالید[٢٨] چەندیان سەر بەچینی بۆرجوازیی شاری سلێمانی بوون، بەلام دوورنییە ڕێژەیەکی گەورەی موریدانی تەریقەتی نەقەشبەندی خەلکی کاسبکارو پیشەگەری ئەم شارە بووبن. چونکە میرانی بابان هەندێ جار پەیوەندی زۆر باشیان لەگەڵ مەولانادا هەبووە، تاساڵی ١٨٢٠ ناکۆکییەکە بەربەست نەکراوەو ئیدی ئەو ڕووی کردووەتە شام. لەجەنگی دووبەرەکیدا، بەرەی میرانی بابان‌و شێخ مارف نۆدێ، سەرکەوتووبوون. تەنانەت ناشتنی (سلێمان پاشای بابان) بەتەنیشت (شێخ مارف نۆدێ)وە شێوەیەکی گرنگەو جۆرێکە لە پشکدارکردنی پیاوە ئایینیەکان لەدەسەلاتی دونیاییدا. دوور نییە گەر هاوکێشەی پشکداریکردن لەدەسەلاتی سیاسیدا بەقازانجی (مەولانا خالید)و تەریقەتی نەقشبەندی ببوایە، داهاتووی میرنشینی بابان بەجۆرێکی تر نەبوایە. تەوژمی سۆفیگەری‌و دەسەلاتی دونیایی، ڕەنگە بزوتنەوەی زۆر بەهێزی لێ پەیدا بێت (نموونە: ڕێکەوتنی میرە سعودییەکان‌و شێخ محەمەد بن عەبدولوەهاب ـ بزوتنەوەی وەهابی) تێکشکانی

کاتیی بزاڤی نەقشبەندی ساڵی ١٨٢٠ گۆڕانی بەسەر کارو جوڵانەوەی نەقشبەندیو چینی بۆرجوازیی شاری سلێمانیدا هێنا. دیارە نوێنەرانی ئەم چینە، بۆ دەرفەتێك گەڕاون، تا لەپێشەوە لەدەسەڵاتی میرانی بابان بدەن. ئەوان، هاریکارییان لەگەڵ هێزی دەرەکیو یارمەتیدانیان بۆ تێکشاندنی دەسەڵاتی ئەو زەمانە، بەکارێکی باشو گونجاویان داناوە، بۆ ئەوەی کۆتایی بەچەوسانەوەو تاڵانکردنو زوڵمو زۆر بهێنن. لەوە دەچێ ئەم چینە لەڕووخاندنی میرنشینی باباندا (١٨٥١) دەوری کاریگەریان گێڕابێت. ئەگینا هیچ هۆیەکی تر ڕەنگە لەئارادا نەبووبێت بۆ (سالمی ساحێبقران)ی شاعیر (١٨٠٠ ـ ١٨٦٦)، کە ئەندامێك بووە لەچینی ئۆرستۆکراتی دەسەڵاتدار، بەم تاڵییە هێرش بکاتە سەر کاسبکارانی شاری:

**لەئەصلا بانیی ئەم کارە کاسبهایی شەهری بوون**
**لە ئەمری فیتنە ئەنگێزا سەرانسەر میثلی مەردانن**

**لەئەوضاعی سلێمانی ئەوانە شادو ئاسودەن**
**لەفەرعا نوطفەیی حەیزن لەئەصلا جنسی شەیتانن**

**گەهی هەم دەردی ئەکرادن ، گەهی هەم عەیشی ئەتراکن**
**لەیەك لا مادەری بەرخن ، لەیەك لا یاری گورگانن**(٢٩)

شیعرەکەی سالم هاوار دەکات، کە (کاسبهایی شەهری) دەوری سەرەکییان لەڕووخاندنی میرنشینی بابان بووبێ: لەئەصلا بانی ئەم کارە. واتە: ئەم چینە وەکو هێزێکی سیاسیی (ئۆپۆزیسیۆن ) دەوری بینیوەو دەستپێشکەری کردووە.

دیارە ئەم شیعرە وەکو زۆربەی شیعرە سیاسیو (ملحمي: داستان)ییەکانی شاعیر پاش هەرەسی میرنشین نووسراون، ئەگینا شاعیر بۆ هۆکار نەدەگەڕا.

ئەڵەمانەکان دەڵێن: سەرکەوتن زۆر باوکی هەیەو ژێرکەوتن یەك باوکی هەیە، واتە یەك (تاکەهۆ)ی هەیە. هەرەسو رووخانو ژێرکەوتنیش لای ئەو (کاسبهای شەهری)یە، نەك دەیان هۆی چارەنووسساز، بەگوێرەی ئەم شیعرە، بەتایبەت ئەم دێرەی خوارەوە:

(گەهی هەم دەردی ئەکرادن ، گەهی هەم عەیشی ئەتراکن)[٣٠]

دەستنیشانکردنی سروشتی ڕاڕاییو ئۆپۆرتۆنیستیی چینی بۆرجوازیە. دیارە وەکو هێزێکی کاریگەر جێ گۆڕکێیان کردووەو بەرەیان گۆڕیوە، بەگوێرەی بەرژەوەندیی ئابووریو بەرتەسك، بەبێ گوێدانە ناسنامەی نەتەوەیی هاوپەیمانو دۆست هاوسەنگەریان گۆڕیوە. ڕەنگە ئەمە تاکە کەس نەگرێتەوەو وەسفە بۆ ئاکاری کۆمەڵایەتیی سەرجەمی چینێك. تاکە کەس ناکرێتە (پێوەر) گەر جارێك ڕوویدات، سالم قورساییو دەوری چالاکانەی ئەم چینەی لەبەرچاو بووە، بۆیە وا دەنووکی خستووەتە سەر. بێگومان ئەم چینە دەوری بنەڕەتیو کاریگەری نەبوایە سالی شاعیر بەم توندو تیژیە رەخنەی لێ نەدەگرتن.

## وێنەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەشیعرێکی سالمدا

دەربارەی سەرجەمی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیو فەرهەنگییەی کە پاش هەرەسهێنانی میرنشینی بابانو ماوەی ڕاستەوخۆی پاش داگیرکردنی شاری سلێمانی، لەلایەن سوپای عوسمانییەوە، ڕوویان داوە بەڵگەی زۆرمان بەدەستەوە نییە، کە بەکۆکردنەوەو خستنەپاڵ یەکترییان، وێنەیەکی گۆڕانی پەیوەندی سۆسیالمان، بەڕاشکاوی پێشکەش بکات. داستانە شیعریەکەی (سالم)ی صاحبقران، کە بەشیعری (ئیپۆس – EPOS) واتە:(ملحمي) دادەنرێت، ڕاستگۆترین بەڵگەی مێژوویی ڕاستەوخۆیە سەبارەت بەڕووداوە تراجیدییەکانی ئەو سەردەمە. سالم ویستوویەتی هەڵوێستو کاری (پاڵەوان)انەی (عەزیز بەگی بابان) بەنەمری بهێڵێتەوە، کە هێزی چەکداری پێکەوە ناوەو، لەگەڵ هێزی چەکداری عوسمانیدا شەڕی زۆر سەختی کردووە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی میرایەتی بابان بگێڕێتەوە. ئێمە وەسفی شاعیر بۆ ڕووداوە دراماتیکییەکان بۆ کەسانی تر جێدەهێڵین، کە دەیانەوێ لەسەر ڕووداوە سیاسییو عەسکەرییەکان بنووسن. مەخابن ئەم شیعرە هێشتا بەلێکدانەوەو ڕاڤەکاری زانستی ساخ نەکراوەتەوەو پەراوێزی بۆ نەکراوە. بەشێکی زۆری ووشەو زاراوەو دەستەواژەی ناو شیعرەکە کۆن بوونو لەئەدەبیاتی ئەمرۆدا، کەس بەکاریان ناهێنێت. ئەم کێشەیە یارمەتیمان نادات لە (کۆد)ەکان بەباشی تێبگەین.

من دەمەوێ تەنیا تیشك بخەمە سەر یەك دوو بڕگەی ئەو تێکست (Text)ە ئەدەبییە، کە ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکانی تێدا بەرجەستە کراون، بەتایبەتی جوڵانەوەو هەڵوێستی چینی بۆرجوازیی شاری سلێمانی، کە مەبەستی ئەوە بووە، ئەو کەلێنەی چینی ئۆرۆستۆکراتی بابانی پاش خۆی جێهێشتووە، پڕی بکاتەوە. بەگوێرەی تێڕوانینی (سالم)[٣١]: ئەو چینە نوێیە لەڕووی ئابووریو

سیاسیی‌و کۆمەڵایەتییەوە، خۆی وا دانابێت، کە بتوانێت ئەو بۆشاییە سیاسیی‌و فەرهەنگییەی داڕووخانی دەسەڵات پڕبکاتەوە:

**چارەسەر کەن ئەهلی دەروێش نانی مونعیمتان بڕا**
**لوولە بوو سفرەو نەواڵە، ون کرا زەرفو خووان**

*خووان: تەختەیەکی لاکێشەیی ڕەنگاو ڕەنگ بووە، شەش پێی هەبووە، قاپی خواردنی لەسەر دادەنراو لەکاتی نانخواردنیدا لەدیوەخان دادەنراو نانی لەسەر دەخورا وەکو مێزی نانخواردنی ئەم زەمانە بووە.*

ئاوابوونی ئەستێرەی دەسەڵاتی چینی ئۆرۆستۆکراتی، چەند دیمەن‌و دیاردەی هاوکاتی بەدەسەڵات گرێدراوەوە، دەبنە بەشێك لەڕابوردوو، لەناو کۆمەڵی (نوێ)دا جێگەیان نابێتەوە. میوانداری‌و سفرەو زەرفو خووانی پاشاو دەسەڵاتدارانی تر، وەکو سەنتەرو ناوەندی کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگیی ئەو سەردەمە، شانۆی نواندنی دەسەڵاتی ئابووری‌و هێزی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی چینی سەرەوەی کۆمەڵ بوو. بەهاتنی سوپای داگیرکەر ((مەجلیس))ی میرو خانەدانەکانی تری ئەو سەردەمە کۆتاییان پێهات:

**ئەهلی ساداتو مەلاو حاجی بلا شین کەن بەسۆز**
**دەفتەری ئەهلی وەزایف دیم عوموومەن حەك کران**

ئەم بەیتە ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ بوونی دامەزراوەی دەوڵەتی‌و نیمچە دەوڵەتی (مؤسسات) کە فەرمانبەرو کارمەند کاری تێدا دەکەن. ئەو ئەم توێژە لەکارکەرانی دەوڵەت بە ((ئەهلی وەزایف)) ناو دەبات: (أهل الوظائف) یان توێژی

فەرمانبەر (موظف) بەگوێرەی ناولێنانی ئەم سەردەمە، توێژێکن لەدەزگای حکوومەتی کەرتی گشتی کار دەکەن. ئێمە نازانین لەسلێمانی (١٨٥١)دا ئەم گروپە کۆمەڵایەتییە چەند بەهێز یان چەند لاواز بووە؟ ئەندامانی ئەم توێژە کێبوون و لەکام چینەوە هاتوون؟

ئێمە لامان ئاشکرا نییە، ئەوانەی فەرمانبەر بوون، لەترسی گوشاری سمبۆلەکانی دەسەڵاتی داگیرکەر نێوی خۆیان سڕیوەتەوە، یان بۆئەوەی ئازار نەدرێن و تووشی سەرئێشە نەکرێن، یان نوێنەرانی دەسەڵاتی داگیرکەر، بەربوونەتە دەفتەرەکان و ناوی فەرمانبەرانی بابانی کوژێنراوەتەوە بۆئەوەی کەسانی تری سەر بەخۆیان لەجێگەی وان دامەزرێنن؟ ئێمە ئیحتمالی دووەم بەڕاست دەزانین و داگیرکەرو داردەستەکانی سەرجەمی دەزگاو فەرمانبەرانیان گۆڕیوە:

**ئەسکەمل بێنن قەراریان دەن لەجێی ئاغەلەران**

**مەجلیس شوورا ئەمێستە خاصە بۆ ئەصنافەکان**

بوونی (مەجلیس شوورا) لەسەردەمی بابانەکاندا، بەڵگەیە لەسەر هەڵسوڕاندنی کاروباری ڕۆژانەی شار، لەلایەن (مەجلیس شوورا)وە. من نانووسم ئەوانە دەوری شارەوانی ئەمڕۆیان بینیوە، بەڵام کۆڵکەزێڕینەی خەیاڵ بۆ ئەوە دەچێت، ژمارەیەك کەسانی ئۆرۆستۆکراتی و دەسەڵاتداری میرنشین ئەندامی ((مەجلیس شوورا)) بووبن. پاش داگیرکردن و ڕووخاندنی دەسەڵاتی بابان ((مەجلیس شوورا)) لەئەندامانی سەرەوەی کۆمەڵ پاکسازی کراون. لەجێگەی ئەواندا کەسانی ((بێ ناونیشان))ی خوارەوەی کۆمەڵ دانراون. ((ئەسنافەکان)) واتە: ((أصناف))ەکان، کە چەمکێکی ترە بەرامبەر پیشەوەر ((حرفي))، کە ئەو زەمانە لەڕۆژهەڵات و بەتایبەتی لەئەدەبیاتی فارسیدا بەکارهاتووە. ئەم ئاڵوگۆڕە

کۆمەلایەتییە لەکودەتایەك دەچێت، کە سەنگەر بەسەنگەر جێگەیان پێ چۆڵ کرابێتو خۆیان لەجێگەی ئەواندا دامەزراندبێت. ئەمەی (سالم) بۆ چینەکەی خۆی بەتراگیدیا تێیدەگات بۆ پیشەوەران، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بووبێت، سەرکەوتنێکی گەورە بووە.

سەبارەت بەزاراوەی (اصناف) لەسەدەی ١٩و سەرەتای سەدەی ٢٠ئێمە زانیاریو شارەزاییمان نییەو نازانین هێزو قەوارەیان چۆن بووە؟ بۆئەوەی وێنەیەکی باشتر پێشکەشی خوێنەرانی ئازیز بکرێت، تیشك دەخەینە سەر جولانەوەی (ئەسناف) لەشاری کرماشان لەسەرەتای سەدەی پێشوودا.

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی شۆڕشی مەشرووتە ١٩٠٥ لەشارەکانی ئێراندا بەدەیان ئەنجومەن (انجمن ـ شورا) پێکهێنرا. ئەنجومەنی ناوەندی هەبوو رابەری ئەنجومەنەکانی خوارەوەی دەکرد. هەر بۆ نموونە، لەشارێکی وەکو شاری کرماشاندا، کە ئەو کاتە ڕەنگە ژمارەی دانیشتوانی (٨٠,٠٠٠) هەشتا هەزار کەس بووبێت، ئەنجومەنی خوێندکاران (انجمن طلاب)و ئەنجومەن سادات (انجمن سادات) هەبووە. لەپاڵ ئەمانەدا ئەنجومەنی پیشەوەران هەبووە (انجمن اصناف):

ئەنجومەنی ئاسنگەران (انجمن آهنگران)و ئەنجومەنی زێڕینگەران (انجمن طلاسازان) هەبوونو دەیان ئەنجومەنی تریشو هەر هەموویان لەبن چەتری ئەنجومەنی یەکێتی پێشەوەراندا (انجمن اتحادیە اصناف) کۆبوونەوە[٣٢].

**وا ( کەریم ئاغەی نەنێ ) تەدبیری هەستەی جاف دەکا**

**( خاڵە هۆمەر ) داروغەی شارو مودیر ( حاجی ئەحان )**

**کەس نەچێتە پێشەوە ( حاجی غەنی ) تەدبیرییە**

**مەئمووری ثەبتی نوفووسەو شاغیلی باجی دوکان**

دارۆغە: لەکاتی بابانەکاندا بەرێوبەری پۆلیس، یان سەرۆکی پۆلیس بووە. سەبارەت بە کەسایەتیو شوێنو پلەی ناوەکان ((کەریم ئاغەی نەنێو خاڵە هۆمەرو...)) ئێمە شتێکی ئەوتۆ نازانین، هەر کەسێك بنو هەرچییەك بن، پلەیەك یان چەند پلەیەك لەخوارەوەی چینی ئۆرۆستۆکراتینو لەگەڵ چێژو زەوقی شاعیردا هەر زۆر دوورن.

**مەجلیسێ وابێ موحەققەق دوودی گۆگرد عوودە بۆی**
**(دەروێش ئاغا) بوو لەجێی (مستۆ) هەموو شەو نەغمەخوان**

خەڵکێك لەو مەجلیسە بۆگەنێکی وەکو بۆنی گۆگرد لایان بۆنی (عوود) بووبێت، کە بۆنێکی زۆر خۆشەو لەڕیزی (مسك)و (عەمبەر) دادەنرێت، دەبێ ئەو خەڵکە چەند ناشارستانیو دواکەوتوو بووبن، لەچاو ئەندامانی توێژی سەرەوەی کۆمەڵ، کە شاعیر خۆی یەکێك بووە لەوان: ئەو مەجلیسە (نوێ)یە گوێی مۆسیقیو زەوقی هونەری بەرزی نەبووە. پێشتر واتە: لەسەردەمی پێش ١٨٥١ گۆرانیبێژێکی دەنگخۆشی وەکو (مستۆ) کە کوردی شاعیریش باسی دەکات:

**ئاغە زەنوون لێ بدا سینەکەمان حارس گرفت**
**لکە تەنبوورو دەفو نەسعەد بدا دەستی لەساز**

**مستۆ ئیبراهیمی ئاورەحمان نەواو فەتحی حەزین**
**مستەفا ناریو سێگا یونس بلێ شاری حیجاز**

کۆڕی گەرم کردووەو لەئاهەنگو بۆنەی شادیدا (نەغمەخوان) بووە. پاش ١٨٥١ لەبری (مستۆ) یەکێکی وەکو (دەروێش ئاغا)، کە دەبێ بەگوێرەی زەوقی

هونەریی (سالم) زۆر دەنگ ناساز بوو بێت، کۆڕو ئاهەنگی گەرم کردووە. بەداخەوە ئەم تێکستە مێژووییە، لەسۆنگەی ساخنەکردنەوەو ڕاستنەکردنەوەی ڕێزمانیو خاڵبەندی، ناتوانرێت بەدڵنیاییەوە سوود لەزانیارییە وردەکانی ناو قەسیدەکە وەربگیرێت.

## ئاڵوگۆڕی مەنسەبی دوو شەخسی عالیجا کرا
## (مەحموود ئاغای) زل حەکیم باشی حەمامچی (بابەجان)

## (حاجی میرزا) کەوتە ناو شارو تەرازووی شاردەوە
## مەسرەف ئاسا حاسیبە بۆ خاسە جاتی (مالوان)

کۆی ئاماژە بۆ (ئاڵوگۆڕی مەنسەب)، کە دیارە ئەو دوو کەسە، پلەی بەرزیان لەناو کۆڕو کۆمەڵی ئەو سەردەمەدا هەبووە (دوو شەخسی عالیجا). لێرەدا من ئەم بەیتە بەڕاست نایەتە بەرچاوم، چونکە (حەکیم باشی حەمامچی) بەبێ وێرگول (فاریزە)و پریپۆزسیۆن بەدوایەکتردا تایپ کراون. من بۆ تێگەیشتنی باشتری ئەم دەقە، ڕۆژی ٢٠٠٦/١/٤ پرسیارم ئاراستەی کاك محەمەد مستەفا (حەمەبۆر)کرد، کە ئەو ئینسکلۆپیدیایەکی زیندوە سەبارەت بەسلێمانیی کۆنو زۆر شارەزایە لەشیعری سالمو کوردیو مەلا حەمدووندا. ئەو دەیگوت: ئەم شیعرە لەسەردەمی عەبدوڵڵا پاشای باباندا دانراوە. (بابەجان) گەورەترین حەکیمباشی زەمانی خۆی بووەو لەگەڵ ماڵی ئێمەدا دراوسێ بووینو باوکم دۆستایەتی لەگەڵ (بابەجان)دا هەبووە. (مەحموود ئاغای زل) کراوەتە حەکیمباشی، کە ڕەنگە لەچاو (بابەجان)دا زانیارییەکی ئەوتۆی لەبواری پزیشکیدا نەبوو بێتو (بابەجان) کراوەتە حەمامچی.

تیشك خستنه سەر وشەی (عالیجا) زۆر پێویستە، کە وشەیەکی ئاوێتەیە (عالي: بەرز)و (جا: جێگا: پلەوپایەی ڕەسمیو کۆمەڵایەتی) دیارە کەسایەتی جێگە نزمیش هەبووە، بۆیە ئەو نووکی قەڵەمی لەسەر (عالیجا) بووە. لەژیانی دەربارو دیوەخانی میران‌و ئۆرستۆکراتیدا، کەسانی وەکو میرزا بابەجانی حەکیم باشی (ملك الاطباء) هات‌وچۆی کردووەو پەیوەندی گەرمی هەبووە.

لەبەیتەکەی پاش ئەوە، نێوی (حاجی میرزا) دەهێنێت، کە تەرازووی ناو شاری شاردووەتەوە. ئێستا، ئەو لەبری (مەسرەف) بەرپرسیاری داهاتی گوندی (مالوان)ی شارەزووره. ئێمە ئەگەر بزانین (مەسرەف) دەوری سەرۆك وەزیرانی بابانەکانی بینیوە، ئیدی هاوکێشەکە بەو لێڵییە نامێنێتەوە. لەبری (مەسرەف) واتە: یەکێکی وەکو (مەحموود ئاغا)و (عەزیر ئاغای مەسرەف) کابرایەکی وەکو (حاجی میرزا) تەرازووی شار دەشارێتەوەو بەرپرسیاری داهاتی (مالوان)ە، واتە: (مەحموود ئاغا)و (عەزیز ئاغای مەسرەف)، کە سەرۆك وەزیرانی سەردەمی بابان بوون لەکوێ‌و (حاجی میرزا) لەکوێ، کە ئەم کارەی پێسپێردراوە؟ هەرچەند من بۆ خۆم لام ڕوون نییە کە ((خاسە جاتی (مالوان) )) داهاتی گوندێکە یان خاڵی کۆکردنەوەی داهاتی شارەزوور، یان هەورامان یان ناوچەیەکی بەرفراوانتر بووە؟

## (ئاغا تەها) مەشوەرەت جۆیە لەگەڵ سەر کاتبی
## وا دەزانم وەرگری حوکمی چیا سەوزو شوان

(ئاغا طه) یەکێك بووە لەهێزە ئابوورییە دەسەڵاتدارەکانی شارو دیارە هەڵوێستی بەرامبەر دەسەڵاتدارانی بابان، بەربەرەکانی‌و ئۆپۆزسیۆن بووە، نەك ڕێکەوتن‌و پشتگیری لەحوکمدارانی پێش ١٨٥١دا. (ئاغا تەها) دەوری ڕاوێژکاری

گێڕاوەو دەبێ دەسەڵاتی داگیرکەر پرس و ڕای پێ کردبێت. لەوەدەچێ (سەرکاتب)ەکەشی پیاوێکی خوێندەوارو بەئاگاو دونیا دیدە بووبێت، ئەگینا لەگەڵ (ئاغا طه) نەدەخرایە تای تەرازووەوەو هەردووکیان لەکاری ڕاوێژکاریدا، وەکو یەك سەیر نەدەکران، ئەگەر هاوتاو یەکسانیش نەبووبن، ئەوە ناویان پێکەوە هاتووە. (ئاغا طه) کوڕێکی هەبووە نێوی (مارف) بووەو ئەویش سێ کوڕی هەبووە، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١. حاجی سەعید ئاغا.

٢. حاجی عەلی ئاغا.

٣. حاجی مەلا محی‌الدین

ئەم سێ برایەو نەوەکانیان، لەژیانی بازرگانی‌و سیاسیدا، دەوریان هەبووە. بەتایبەتی (حاجی سەعید ئاغا)و (حاجی مەلا محی الدین) کە پاشتر بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لەبەردەستدا هەن لەسەریان دەنووسین.

## هۆزی کۆچەرو گروپی ئایینیو ڕاپەڕینی ساڵی ۱۸۸۱

ئاوابوونی ئەستێرەی میرنشینی بابانو هەڵوەشاندنەوەی میرایەتییەکەی بەجارێ بەهاری بۆرجوازیی کوردی نەهێنایە چۆکانو باریان لەباجو سەرانە سووك نەکرایەوە. گروپێکی کۆمەڵایەتیی نوێ لەڕووی ئابووریو کۆمەڵایەتی (بۆشاییی) پڕکردەوەو خۆی گەیاندە ڕیزی پێشەوە، هەرچەندە بەڕەسمی دەسەڵات بەدەست حاکمو مووچە خۆری تورکەوە بوو، باجو سەرانەو بێگاری گروپی کۆمەڵایەتی نوێی دایهێنا، کە هەموو سنوورێکی بەزاندو زۆریش لەسەردەمی بابانەکان زیاتر بوو[٣٣]. هەر بازرگانو کاسبکارێکی شاری، دەبوایە لەبن چەتری پارێزگاری سەرۆك هۆزێکدا خۆی حەشاردات‌و کاروکەسایەتیو ژیانی مسۆگەرکات. ئەم سەرۆك هۆزانە وەکو شەریکەی (تأمین INSURANCE-) بوون. ئەوەی خۆی زامن نەکردبێ، مەترسی گەورە، خۆی بۆ مت کردبوو. ئەمانە دەبا بەبەردەوامی سەری خۆیان بقەبڵێنن، بۆئەوەی کاروان لەچەتە و ڕێگر و شەوکوت بپارێزرێت.

لەشاری سلێمانیدا، بەگوێرەی قسەی (مێجەرسۆن) کە سەرەتای سەدەی پێشوو بەسەردانێکی نهێنی لەوێ ماوەتەوە، بەرەی شێخان (نەوەکانی شێخ مارفی نۆدێ) تۆڕێکی چڕو پڕیان چنی، بۆئەوەی لەماوەیەکی زۆر کورتدا سەروەت‌و سامانێکی گەورە پێکەوەبنێنو دەست بەسەر زەویو زارێکی فراواندا بگرن. خەستبوونەوەی چەوسانەوەو سەرانە سەندنو باج بەرە بەرە پاڵی بەبازرگانو کاسبکارانەوەنا، ڕاپەڕینێك بەرپابکەن.

نوێنەرانی چینی بۆرجوازی، پەیوەندییان بەهۆزی هەمەوەندەوە کرد، کە ئەو زەمانە بەعەشیرەتێکی جەنگاوەرو چاونەترس ناویان ڕۆیشتبوو، بۆئەوەی لەیەك کاتدا پەلاماری حاکمی عەسکەریی عوسمانیو بنەماڵەی شێخان پێکەوە

بدەنو لەشاریان دەرپەڕێنن. لەڕاپەڕینی ساڵی ۱۸۸۱دا، شار هێندەی نەمابوو بکەوێتە دەست کۆمەڵانی خەڵکەوە، ئەگەر پەلاماری هێزی سەربازیی عوسمانی نەبوایە، کە بەتوندی هێرشیان کردە سەر ڕاپەڕیوەکانو[٣٤] سەرکوتیان کردو هەر بەچرۆیی هەڵیان پرواند.

## مانگرتنو ناڕەزایی دەربڕین

لەوەدەچێ چینی مام ناوەندی شاری سلێمانی، چینێکی چاوکراوەو وریاو بەئاگاو هۆشیار بووبێتن، لەچاو هەندێك لەشارەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی لەکۆتایی سەدەی ۱۹و سەرەتای سەدەی بیستەمدا. پێش شۆڕشی مەشرووتەی ساڵی ۱۹۰۸، بەشەش ساڵ (۱۹۰۲) بەشێك لەبازرگانو کاسبکارو زانایانی شار بروسکەی پەژارەو ناڕەزاییان ڕەوانەی سوڵتان عەبدولحەمید کردووە[٣٥]. ئەو بروسکەیە سێ جار دژی پارێزگار (متصرف)ی سلێمانی بەرز کراوەتەوە. سەدو شەش بازرگانو زانای دینی مۆریان پێوەناوەو ناوی خۆیان لەسەر نووسیووە. لەکۆی ئەو (۱۰٦) کەسە (۲٤)یان زانای ئاینینو (۸۲)یان بازرگانن (لەبەڵگەنامەکەدا نووسراوە: سليمانيه تجارلرى).

لەناوەڕۆکی بروسکەکە ئەم سێ خاڵە بەڕوونی دەردەکەون:

١. زوڵموزۆرو چەوساندنەوەی ئیدارەی شار (متصرفیە) زۆر توند بووە، بۆیە ئەو خەڵکە هاواریان لێ هەڵساوە. چەوساندنەوەکە ئابووریی و کۆمەڵایەتی بووە: (ئەوەتا داهاتو کڕینو فرۆشتن پەکیان کەوتووەو هەر ئەوەمان بۆ ماوەتەوە، بۆ ئاسوودەییو پاراستنی عەرزو نامووسمان خۆ بدەینە دەست باری تەعالا!).

٢. ئەو بازرگانو کاسبکارانە، بەشێوەی شارستانی دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردووەتەوە، کە پێی دەگوترێت (سڤیل کوراج - Civilcourage) بەعەرەبی دەبێتە (العصيان المدني) لەلایەکەوە، ئەوەی ئێمە پێی بزانین(٣) سێ برووسکەیان ڕەوانەی سوڵتانی عوسمانی کردووە، لەلایەکی ترەوە بۆ ماوەی مانگێك مانیان لەکار گرتووەو دوکانیان داخستووە. ئەمەش بۆ ئەو زەمانە هەر زۆر بووەو ڕەنگە ئەم مانگرتنە دووەم مانگرتنی بازرگانو کاسبکارانی شاری سلێمانی بووبێت پاش راپەڕینی ١٨٨١ کە یەکەم ڕووداوی سیاسیی شارییە. ئەم دوو راپەڕینو مانگرتنو چالاکییە سیاسییە، دەکەوێتە پێش( ٦)ی ئەیلوولی ڕەشی ١٩٣٠وە کە زۆربەی مێژوونووسو ڕووناکبیران پێیانوایە، ڕووداوی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ یەکەم جووڵانەوەی سیاسیی بۆرجوازی شارییە. من پێشنیار دەکەم ئەنجومەنی پارێزگای سلێمانی لەناو هۆڵی پارێزگاو زانکۆو شوێنی تریشدا وێنەی ئەم برووسکەیە بەگەورەیی هەڵواسێو لەبەرچاوی خەڵك بەڕێزەوە سەیر بکرێتو وەکو بەڵگەنامەیەکی گرنگ شانازی پێوە بکرێت، چونکە وشەی (ئازادی) تێدا نووسراوە. ڕۆژی ناردنی برووسکەکە ڕۆژی شاری سلێمانی بێت.

٣. ئەو خەڵکە داوای (ئازادی)یان کردووە. واتە: چەمکی ئازادی (حوریەت) لەڕۆژئاواوە پاش هاتنی ئینگلیز (١٩١٨) پێمان نەگەیشتووە، بەڵکوو (١٦) ساڵ پێش ئەو تاریخە بەگوێی خەڵك ئاشنا بووە.

ئەمە یەکەمین بەڵگەنامەیە، کە بەدەستی ئێمە گەیشتووەو دوو زاراوەی گرنگی مۆدێرنی تێدا بەدی دەکرێت: ((حریة)) و ((عدالة)) من هەردوو چەمکەکە، بەشێوەی عوسمانی ناو بەڵگەنامەکە وەکو خۆی دەنووسمەوە. ئەم دوو زاراوەیە هەر لەکاتی شۆڕشی فەرەنسییەوە بەهەموو جیهاندا بڵاوبووەوە: ئازادی، یەکسانی، برایەتی Liberté, égalité, fraternité

دیارە پێش ئەم مێژووە نوێنەرانی بۆرجوازی کوردیش ئاشنایەتییان لەگەڵ ئەم چەمکانەدا پەیدا کردبێت، ئەمە جێگەی سەرنج و ڕاوەستانە، بەڵگەی هۆشیاریو چاوکراوەییە. ڕاستە ڕستەکە بەتەمو هەڵاوی ئاینی داپۆشراوە، بەڵام هەر بەکارهێنانی ووشەکان لەبرووسکەیەکی نارەزایی بۆ سوڵتانو سەرۆك وەزیران، نیشانەی تێگەیشتنو ئاگاییە لەسەرەتاو بیروباوەڕی شۆڕشی فەرەنسیو جووڵانەوەی ئۆپۆزسیۆن لەئەستەمووڵو شارەکانی تری دەوڵەتی عوسمانیدا.

## ئیدارەی شار

دەبێ ئەو ڕاستییەش بەژێر لێوەوە نەکرێ، کە تەنیا میرەکانی بابان و بەرەی شێخان خۆیان دەوڵەمەند نەکرد، بەڵکو هەندێ خاوەن زەویی گەورەو بازرگانی دەستڕۆیشتووش، کەتوانیان بەفرو فێڵ و تەزویرو پەیوەندیی سیاسیی بەدەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە، پوول و پارەیەکی زۆر کۆکەنەوە. لەڕێگەی ئامرازی سیاسییەوە دراوێکی زۆر بەگەرووی (کەناڵی ڕەش) دا تێپەڕێنن. هەندێ بازرگانی گەورەو خاوەن موڵکی مەزن و دەوڵەمەندی شاری سلێمانی، ماوەیەکی دوور و درێژ ئەنجومەنی شارەوانییان[٣٦] داگیر کردبوو.

هەروەکو (حنا بطاطو) بەم شێوەیەی خوارەوە لەسەریانی نوسیووە:

١- مسۆگەر کردنی ئەندامێتی ئەنجومەنی شارەوانی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ.
٢- هەڵبژاردنی ئەو باجگرانەی کە ڕاستەوخۆ سەربە ئەوانن.
٣- باجدان تەنیا لەسەر کاغەز ، بەبێ وەرگرتنی پارە.
٤- تەنگ پی هەڵچنینی خاوەن موڵك، بۆ ئەوەی بەهەرزان موڵکەکەی فرۆشێ.
٥- گرێدانی پەیوەندی لەگەڵ هەندێ لایەندا، بۆ ئەوەی بتوانن هەر مەبەستێکیان هەیە، بیهێننەدی.

## هەشت کەسایەتیی ئابووری و سیاسیی سەرەتای سەدەی بیستەم

لەناو شاری سلێمانیدا، سەرەتای سەدەی بیستەم، کۆمەڵێك خەڵکی دەوڵەمەند ناویان ڕۆیشتووە. ئەمانە لەڕیزی خاوەن موڵك و زەویداردا بوون، تا دەوڵەمەندی بواری بازرگانی، زانیاری سەبارەت بە هێزی دراویی و پەیوەندی سیاسی و شێوەی بیرکردنەوەیان، لەئەشکەوتی تاریکی نەزانیدا ماوەتەوە. لێکۆڵەری چالاك، دەتوانێ ناوی کەسانی دەوڵەمەندی ئەو سەردەمە بدۆزێتەوەو لێتوێژینەوە لەسەریان تۆمار کات. من لەم دوورەوە هەر بەنامە، پەیوەندیم بەمامۆستا (موحەمەد رەسوڵ هاوار)ەوە کردو ئەویش بەکورتی لەسەر چوار کەسی نووسیبوو. پاشان مامۆستا (رەفیق)و (سدیق ساڵح) لەپێشەکی (ژیان)و ڕۆژنامەکانی تردا کۆمەڵێك زانیاری وردیان لەسەر کەسایەتییە ڕووناکبیرو ئیدارییەکانی ئەو سەردەمە بڵاوکردووەتەوە[٣٧].

### (١) حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا:

هاوار نووسیویە: (حەمە ئاغای عبدالرحمن ئاغا) یەکێك بووە لەبنەماڵەی مەحمود ئاغا مەسرەف (مصرف)، کە لەزەمانی (ئەوڕەحمان پاشای بابان)دا سەرۆك وەزیرانی بابانەکان بووە. (ریچ) لەگەشتەکەیدا باسی (مەحمود ئاغا)و (عەزیز ئاغا)ی مەسرەفی کردووە کە هەردووکیان لەیەك بنەماڵە بوون[٣٨].

حەمە ئاغا (١٨٨٧-١٩٦٢) لەکابینەی زەمانی (شێخ مەحمود)دا پۆستی وەزارەتی (نافعە)ی پێ دراوەو بەپیاوێکی نیشتمانپەروەر ناسراوە. هەر لەباووباپیرەوە موڵك و ماڵێکی زۆری بۆ مابووەوە، چ گوندو چ زەوی و زار، لەناو شاری سلێمانیدا، کەبریتی بوون، لەخانووبەرەو قەیسەری و دوکان.

### ٢- حاجی سەعید ئاغا (١٨٦٢-١٩٦٢):

لەبنەماڵەی (ئاغا طه)یه، کە یەکێك بوو لەدەوڵەمەندە موڵکدارە بازرگانە ناسراوەکانی سلێمانی، ماوەیەك، لەزەمانی ڕژێمی مەلەکیدا، ئەندامی (مجلس الاعیان) بوو. (حاجی سەعید مامی تەها محیدین معروف ـ جێگری سەرۆك کۆماری عیراق لە ١٩٧٤ بە دواوە). من لەخەڵکی شارەزام بیستووە، کە باپیرە هەرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە، بەپیشە (هەلاج) بووەو لەدەرگەزێنی هەمەدانەوە هاتووەو لەقەڵاچوڵان جێگیر بووە. سەبارەت بە (دەرگەزێن)و دەرگەزێنییەکان (مشتومڕ)ێکی سەخت هەیەو هەریەکە دەیگێڕێتەوە سەر بنجێك.

### ٣- فەتاح بەگی ساحێبقران:

باوکی ئەحمەد بەگی ساحێبقرانە (حەمدی شاعیر)، خاوەن موڵك بووەو زەوی‌و زارێکی زۆری لەدەوروبەری شاری سلێمانیدا هەبووە.

### ٤- ئەوڕەحمان ئاغا:

ئەوڕەحمان ئاغا (عەبدوڕەحمان ئاغا) کوڕی (ئەحمەد پاشا کوڕی حاجی قادر ئاغا کوڕی عەبدوڕەحمان ئاغای کوڕی مەحمود مەسرەفە)، ساڵی ١٨٨٤ لەسلێمانی لەدایك بووە. لەحوجرەی تایبەتدا فێری خوێندن‌و نووسین‌و ، دواجار تورکی‌و فارسیش بووە. بە بنەماڵە، دەوڵەمەندو موڵکدار بوون. موڵکێکی زۆری لەباوکیەوە بۆ بەجێما، لەم شوێنەدا: دەشتی شارەزوور، هوانە، ژاڵە، قرگە، بێسان سووری سەروووخواروو، چەندین گوندی تر، بۆ یارمەتیدانی جوتیارانی ئەو گوندو ناوچانە، ئەو زەوی‌و زارانەی داوە بەجوتیارانی ئەو شوێنانە بەمەبەستی ئەوەی کە کشتوکاڵی تیادا بکەن‌و بژێوی ژیانیان مسۆگەر بکەن، جگە لەو موڵکانە، لەشاری سلێمانیشدا چەند خانوویەکی هەبووەو ماڵەکەشی کە لەچەند

دیوەخانێك پێكهاتبوو كەوتبووە بەرامبەر مزگەوتی دوودەرگای شەقامی (نالی ـ ئەسحابەسپی)یەوە، دەورانی حوكمی عوسمانی، دووجار، هەرجارەی بۆ ماوەی دوو ساڵ، ئەندامی مەجلیسی ئیدارەی لیوای سلێمانی بووە: لەمایسی ١٩٠٨و تشرینی یەكەمی ١٩٠٩ بەدواوە. لەپاڵ ئەوەدا، نازری ئەعشاریش بووە. هەر ئەو سەردەمە، دوو ساڵ مەئمووری ئەوقاف بووە.

دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی عوسمانی، لەئابی ١٩٠٨دا كراوە بەئەندامی هەیئەتی تەفتیش بۆ هەڵبژاردنی مەبعووسی لیوای سلێمانی. یەكەم خولی حوكمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لەناوچەی سلێمانی، ١٩١٩/٦/٢ ـــ ١٩١٩/٩/٣٠ بەڕێوەبەری ناحیەی سرۆچكو دوایی تا ١٩١٩/١٢/٢٨ بەڕێوەبەری ناحیەی تانجەرۆو، ئەمجا تا ١٩٣٠/٤/٣٠ بەڕێوەبەری ناحیەی قەرەداغو لەو مێژوومیشەوە تا ١٩٢٢/٩/٥ قایمقامی قەزای شارباژێڕ بووە(٣٩).

ڕەنگە لەدەورانی دووەم حكوومەتی كوردستاندا، هەمان وەزیفەی هەبووبێ. ڕۆژگاری سێهەم حكوومەتی كوردستانیش، سەرەتا قایمقامی شارباژێڕ بووە. لەئەیلوولی ١٩٢٣دا كراوەتە سەرۆكی شارەوانیی سلێمانیو، تا ١٩٢٤/٢/١٣ ماوەتەوە، لەهەوەڵی حوكمی پاشایەتیشدا، ماوەیەك بەڕێوەبەری ناحیەی تانجەرۆ بووە. ئەندامێكی دامەزرێنی (هەیئەتی وەطەنییە) بووە كە نیشتمانپەروەران ساڵی ١٩٣٠ بۆ داواكردنی مافی نەتەوەیی كورد لەسلێمانی، پێكیانهێناوە. ڕۆژی١٩٤٧/١/١٦كۆچی دوایی كردووە(٤٠).

### ٥- ئاغا فەتحوڵلا عەبدوڵلا ئەفەندی

کوڕی (حاجی عەبدوڵلا)یە کە ناسراو بووە بە (حاجی عەبدوڵلا درێژ)، (حاجی عەبدوڵلا) مرۆڤێکی دنیا دیدەو قسەزان بوو. (ئاغا فەتحوڵلا) لەدەوروبەری ساڵی (١٨٦٠)ی زایینی لەشاری سلێمانی هاتووەتە دنیاوەو لەو سەردەمانەدا هەروەك کەسانی دیکە لەمزگەوتەکاندا خوێندویتیو باوکیشی لەم بوارەدا یارمەتیداوە بەوەی کە چەندین کتێبی بۆ پەیداکردووە بەتایبەتی تورکیو فارسیو کەمێکیش عەرەبی، گەرچی لەو سەردەمانەدا عوسمانییەکان باڵادەست بوونو زمانی تورکیش زمانی ڕەسمیی وڵات بووە، باوکی ویستوویەتی کوڕەکەی زیاتر فێری زمانی تورکی بێت، بەڵام کوڕەکە خۆی زیاتر ئارەزووی لەخوێندنەوەی کتێبی فارسیو عەرەبی کردووە، چونکە لەو سەردەمانەدا کتێبی کوردی نەبوون، ئەگەر هەشبووبن زۆر دەگمەن بوون. لەتەمەنی پانزە ساڵیو بەرەو ژووردا، یارمەتیو هاریکاری باوکی کردووە لەڕووی بازرگانییەوە بۆ هێنانی شتوومەك بۆ سلێمانی، لەگەڵ باوکیدا بەڵێننامەیەکی بازرگانی لەگەڵ چەند بازرگانێکی شارەکەدا ئیمزا دەکەن بەوەی کە لەشاری (ئەستراخان - ئەشتەرخان)ی ڕوسیاوە کە لەو سەردەمەدا شوێنێکی بازرگانیی گرنگ بووە، شتومەکیان بۆبێتو ئەو کەلوپەلانەی کە لەو شارەوە دەهات ١٠٪ی دەخرایە سەر، ئەگەر لەوە زیاتربوایە بەگوناهیان دەدایە قەڵەم. لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، سوپایەکی لەسەر ئەرکی خۆی پێکهێناوە لەدژی سوپای ڕوس، بەپێی ئەو فەرمانەی کە لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە لەئاستانە (ئەستەمووڵ) لەساڵی (١٣١٢)ی کۆچی کە دەکاتە دەوروبەری ساڵی (١٨٩٤)ی زایینی دەرچووە، وەك ئەوەی لەوێنە کۆپییەکەدا دیارە، سوڵتان (عەبدولحەمید) خەڵاتی مەجیدیی پلە سێیەمی بەخشیووە بە (ئاغا فەتحوڵلا)، لەبەرئەوەی کەسێکی خوێندەوارو بەسەلیقەو زمانزان بووە، کاربەدەستانی عوسمانی، پاش

هەلگیرسانی شۆڕشی مەشروتە لەساڵی ١٩٠٨و لەبەرئەوەی یەکێك بووە لەدەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵی (ئیتحادو تەرەقی) بووە بەجێگەی بڕواپێبوونی، ئەوەی پێدراوە کە بیکەن بەسەرۆکی شارەوانیی سلێمانی، بەم پێیە لەکانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٢)دا لەو وەزیفەیە دایدەمەزرێنن. کە لەو سەردەمانەدا پێیان دەگوت (هەیئەتی مەشوەرەت)، لەکاتی سەرۆك شارەوانیدا بۆ چەند گەڕەکێك ئاوەڕۆی دروستکردووەو (وشکەسی - چەوڕێژ)ی هەندێك کۆڵانیشی کردووە، هەروەها بەپێی تواناش چووە بەدەم داواکارییەکانی هاوولاتیانەوە، بەڵام لەو سەردەمانەدا، بەشی زۆری داواکارییەکانی خەڵکی لەلایەن شارەوانی ئەو کاتەوە جێبەجێ نەکراوە، چونکە داهاتی ئەوسای عوسمانی لەڕووی باری ئابوورییەوە لاواز بووە، بەشی زۆری داهاتەکەی بۆ مەبەستی سەربازی تەرخان دەکرد، بۆ جاری دووەم لەمانگی نیسانی ١٩١٥ لەشارەوانی بەردەوام دەبێت، پاشان لەبەر نەخۆشی، دەست لەو وەزیفەیە دەکێشێتەوەو خۆی بەکاروباری بازرگانییەوە خەریك دەکات.

### ٦- حاجی مەلا محێدین مەعروف

کوڕی (حاجی مەعروف ئاغای ئاغا تەها)یە، کە بەبنەماڵەی (ئاغا تەها) ناسراون، ئەم بنەماڵەیە کاتی خۆی لەناوچەی (بانە)ی کوردستانی ڕۆژهەڵات (ئێران)ەوە هاتوونەتە شاری سلێمانیو لەگەڕەکی (دەرگەزێن) نیشتەجێبوون، لەسەرەتای ساڵانی حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا (حاجی مەلا محێدین) لەو گەڕەکەدا لەسلێمانی هاتووەتە دنیاوە، پاشان (مەعروف ئاغا)ی باوکی لەگەڕەکی (سابونکەران) خانوویەك دەکڕێتو بەخاوو خێزانەوە بۆ ئەو گەڕەکە دەچن، لەلایەن باوکیەوە، لەمزگەوتەکانی ئەو سەردەمەدا بۆ خوێندن دەنێردرێت، پاشان لەگەڵ باوکیدا، بازرگانیی دەکەنو توتن لەسلێمانییەوە بۆ بەغداو موسڵو

ئێران دەبەن، پاش ئەوەی (حاجی مەعروف) سامانێکی زۆر پێکەوە دەنێت، چەند پارچە زەوییەك لەگەڕەکی سەرکارێزدەکڕێتو دەیکات بەخانوو کە ئەو سەردەمانە ئەو گەڕەکە چۆڵەوانی بووە، کە خانوو لەوێدا دەکاتەوە، چەند کەسانێکی تر چاو لەم دەکەنو لەوێدا خانوو دروست دەکەن، بەمجۆرە، گەڕەکی سەرکارێز (حاجی مەعروف)و چەند کەسانێکی تر ئاوەدانی دەکەنەوەو پاش ماوەیەك دەبێت بەیەکێك لەگەڕەکەکانی شار، پاشان (خان)ێك دروست دەکات کە بە (خانە سوتاوەکە) بەناوبانگ بوو، (حاجی مەلا محێدین) لەبەرئەوەی خوێندەواریی هەبووەو وریاو بەسەلیقەش بووە، لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانلی ئەو کاتەوە لەساڵی (١٩١٢)دا، دەیکەن بە (ئەندامی مەجلیسی بەلەدیە)و پاشان لەساڵی (١٩١٤)ەوە تا کۆتایی مانگی ئازاری (١٩١٦) دەکرێت بە (ئەندامی مەجلیسی لیوای سلێمانی)، دوای ئەوە لەمانگی نیسانی ١٩١٦دا، دەکرێت بەسەرۆك شارەوانیی سلێمانیو تا مانگی ئازاری ١٩١٧ لەو وەزیفەیەیدا دەمێنێتەوە، لەبەر نەبوونی بەڵگەنامەیەك کە لەبەردەستدا بێت، نازانرێت چ کارێکی خزمەتگوزاریی بەشارەکە کردبێت، بەڵام لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا جەنگی یەکەمی جیهانی بووەو فەرمانڕەوایانی عوسمانلی سەرقاڵی جەنگ بوون، پێناچێت هیچ خزمەتگوزارییەکی داواکراو، یان پێویستکراو بۆ ئەو شارە کرابێت، پاش ئەوەی لەسەرۆك شارەوانی دەستی دەکێشێتەوە، لەگەڵ حاجی سەعیدی برایدا لەو خانەی کە هەیانبوو کارو کەسابەت دەکەن.

### ٧ ـ حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکی زادە (١٨٦٢ ـ ١٩٣٨)

حاجی (مەلا سەعید) بازرگانێکی گەورە بووە. یەکەمین کوردە کە لەپەرلەمانی عوسمانیدا (مجلس مبعوثان) ڕۆژی ١٩٠٨/١٢/١٧ وەکو یەکێکی سەر بەکۆمەڵەی (ئیتحادو تەرەقی) هەڵبژێردراوە. لەحکومەتی سەردەمی (شێخ مەحموودی حەفید)دا (١٩٢٢) پۆستی وەزارەتی داد (رئیس عدل)ی پێسپێردراوە.

حاجی (مەلا سەعید) هەر بەمناڵی خراوەتە بەر خوێندنی مزگەوتو لەزانستە دینییەکاندا زۆر شارەزا بووە. شان بەشانی بازرگانی، موڵکی لەناو شاری سلێمانیدا ((هەموو گەڕەکی ئیسکانو عەقاری) لەدەرەوەی شاریش (زرگوێز، سەدوبیست، ساماوات، خەرجانە، دوو ـ وەر (دەکەوێتە سەر پردەکەی باسەڕەوە) لەبەغداش خانو دوکانو موڵکی هەبووە)).

حاجی (مەلا سەعید) زەمانی خۆی، جوانترینو گەورەترین تەلاری هەبووە. کاتێك جەنرال (عەلی ئیحسان پاشا)، کە (قائد فرقە)ی سوپای عوسمانی ساڵی ١٩١٥ بەسەردان بۆ سلێمانی دێت لەماڵی ئەو میوان دەبێت.

حاجی (مەلا سەعید) نێوی کەرکوکی زادەیە، بەبێ ئەوەی بەڕەچەڵەك کەرکوکی بێت. (حەمە کەرکوکی)، کە دەبێتە باپیرە، لەئەنجامی کەراماتی باوەگوڕگوڕ، دایکی دووگیان دەبێتو ئەم ناوەیان بەسەردا دادەبڕێت. (حاجی مەلا سەعید) باپیرەی کاك (جەمال حەکیم)ە. کەواتە: زنجیرەی باوباپیرانی ئەو بەم شێوەیە بۆ ماوەتەوە. جەمال ئاغا، حەکیم، حاجی مەلا سەعید، حاجی عەبدوڵڵا، حەمە کەرکوکی، یونس ئاغا، حاجی ئەحمەد، شارەزووری بووەو لەوەدەچێ بازرگان بووبێتو لەگەڵ دامەزراندنی سلێمانیدا، ئەمیش گواستویەتییەوە بۆ ئەم شارە.

کەسایەتیەکی گرنگتر لەناو ئەم بنەماڵەیەدا هەڵکەوتووە ئەویش (حاجی عەبدوڵڵایە). بازنەی بازرگانی ئەم سنووری ناوچەکەی تێپەڕاندووە. ئەم لەگەڵ

(ئەشتەرخان)و (بەغدا)و (هەمەدان)دا بازرگانی کردووەو قافڵەی گەورەی هاتوچۆی کردووە. نەوەکانی، ئەوە دەگێڕنەوە کە ماوەی (٢٤) ساڵ لەئەشتەرخان مابێتەوەو لەوێ فێری زمانی ڕووسی بووە. (حاجی مەلا سەعید)و (پیرەمێردی شاعیر) هاوزاوا بوون[٤١].

## ٨ ـ ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ:

ئەحمەد بەگ کوڕی تۆفیق بەگ تابوور ئاغاسی کوڕی محەمەد ساڵح بەگ کوڕی سلێمان بەگی قەوواس (غەواص)و لەبنەماڵەی خەندانە. ساڵی ١٨٩٨ لەسلێمانی لەدایکبووە. لەموسڵ و کەرکوك و سلێمانی، لای مامۆستای تایبەت خوێندوویەتی. ساڵی ١٩١٤ ئەعدادیی مولکیی تەواو کردووە. قەومانی یەکەم جەنگی جیهانی، ڕێی درێژەپێدانی خوێندنی لێ بەستووەتەوە.

لەوە بەدوا، تا کۆتایی حوکمی عوسمانی لەسەر ژیانی، شتێکی ڕوون و ئاشکرا لەبەردەستدا نییە. ئەوەندە هەیە، وەك یەکێك لەبنەماڵەیەکی دەستڕۆو ناسراوی شار، لەئەشراف بووە. لەیەکەم جەنگی جیهانیدا، لەبەری توریزو سابلاخ و بۆکاندا شەڕی کردووە. کە ئینگلیز یەکەمجار شاری کەرکوکی گرتووە، تورك ئیدارەی سلێمانیی پێ سپاردووە. بەلام لەدوای ئەو دراوەتە (شێخ مەحموودی گەورە)، چونکە بە بەدەسەلاتترو گەورەتری زانیوە، هەر ئەو ماوەیە لەگەڵ شێخدا پێکهاتووە، پەیوەندی بەسەرکردەی هێزەکانی ئینگلیزەوە بکرێ، تا ئیدارەی ناوچە کوردنشینەکان بەسەرپەرشتی ئەوان بدرێتە کورد. کە ئینگلیز کەرکوکی چۆڵ کرد، تورك وەك چۆن دوای هاتنەوە بۆ سلێمانی (شێخ مەحموود)ی گرت و بردییە کەرکوك، بەلام لەبەرئەوەی کە باوکی لەشەڕی دژی ڕوسدا شەهید بووبوو، سەرخێلانی پشدەرو سنجابی و قوبادی و باواجی

بروسکەیان بۆ حکومەتی تورك لێدابوو کە ئەوان بەهاندانی (ئەحمەد بەگ) هاتوون بۆ خزمەتی تورك، بەردراوە.

ڕۆژی ١٩٢٢/٧/٢١ بەئەندامێکی دەستەی بەڕێوەبردنی "جەمعیەتی کوردستان" هەڵبژێردراوە لەسلێمانیو، تا هاتنەوەی شێخ چالاکیی هەبووە. (مێجەر گۆڵد سمیث)ی حاکمی سیاسیی ئینگلیز، ڕۆژی ١٩٢٢/٩/٥ کە بڕیار درا شار چۆڵ بکەن، بەئەندامێکی ئەو ئەنجومەنەی بەڕێوەبردنی لیوای سلێمانی داینا کە دواتر بووە "مەجلیسی میللیی کوردستان". یەکێك لەو ئەو کەسانە بوو کە ١٩٢٢/٩/١٩ بەداوای شێخ بۆ پێشوازی چوونە کفریو، ٩/٢٥ گەڕانەوە.

کە شێخ ١٩٢٣/٣/٤ سلێمانیی بەجێ هێشت، (ئەدمۆندز) لە ١٩٢٣/٥/١٨وە کردیە سەرپەرشتیاری گشتی هەموو دائیرە مەدەنییەکانی شار. لەڕۆیشتنە عومومییەکەی ١٩٢٣/٦/١٧دا چووە کەرکوك. ساڵی ١٩٢٤ بەئەندامێکی نائیبی لیوای سلێمانی بۆ ئەو مەجلیسە تەئسیسییە دەست نیشانکرا کە ڕۆژی ٣/٢٧ کرایەوەو لە ٧/٢٦یشدا هەڵوەشێنرایەوە.

دوادواییەکانی تەموزی ١٩٢٤، لەگەڵ کاپتن (چاپمان)و هێزەکانی حکومەتی عیراقو ئینگلیزدا، هاتەوە بۆ سلێمانی. لەشوباتی ١٩٢٥ بەموعتەمەدی "جەمعییەتی مودافەعەی وەطەن ـ سلێمانی" دانرا کە بۆ پشتیوانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی جنوبی) بەعیراقەوە پێکهێنرا.

١٩٢٥/٣/٧ کرایە یەکەم موتەسەریفی حوکمی پاشایەتی لەسلێمانی. کۆتایی تشرینی یەکەم یا سەرەتای تشرینی دوومی ١٩٢٥ بووە سەرۆکی (ئەنجومەنی مەعاریفی لیوای سلێمانی) کە بۆ وەرگێڕانو دانانی کتێبی کوردی دامەزرێنرا. ١٩٢٦/٤/١٣ بەسەرۆکی "جەمعیەتی زانستی کوردان" هەڵبژێردرا. لە ١٩٢٧/٤/٩ بەداوای حکومەت دەستی لەموتەسەریفی کێشاوەتەوە، چونکە ـ خۆی وتەنی ـ گومانی لەدڵسۆزی هەبووە.

لەوەبەدواوە، بووە بەئەندامێکی "جەمعییەتی هیوا ـ ١٩٢٨" کە نهێنی بووە. ڕۆژی ١٩٣٠/٩/٢٨ کرایەوە بەموتەسەریفی لیوای سلێمانیو، گیراوەکانی شەڕی بەردەکی سەرای بەڕەڵلا کرد. تا ١٩٣٥/٤/٢٤ لەو پۆستەدا مایەوە. لە ١٩٣٥/٤/٢٥ بەموتەسەریفی گوێزرایەوە بۆ لیوای هەولێر. ئەو وەزیفەیەی تا ١٩٣٩/٤/٢٤ی خایاند. هەمانساڵ، بەپلەی موفەتیشی ئیداری لەوەزارەتی ناوخۆ، برایە بەغدا. ساڵی ١٩٤١، لەسەر هەڵوێست نواندن، راپۆرتی لێدراو، خانەنشین کرا.

لەهەرای (ڕەشید عالی گەیلانی)دا (١٩٤١)، وەختێك بەسەردان لەناوچەی سورداش بووە، حکومەتی تازە داوای لێکردووە کە وەزیفە وەربگرێ و ڕەتی کردووەتەوە. لەدەیەم خولی هەڵبژاردندا، (١٩٤٣/١٠/٩ ـ ١٩٤٤/٥/٣١) بۆ ئەندامێتی مەجلیسی نیابی، بەنائیبی سلێمانی هەڵبژێردراوە. بەڵام کۆتایی تشرینی دووەمی ١٩٤٣، خۆی لێکێشاوەتەوە. ڕۆژانی دوایی تەمەنی، بەداهاتی موڵکەکانی ژیاوە. ساڵی ١٩٦٢ خۆیو نەژادی کوڕیو (حەمە ساڵح بەگ)ی خزمی، لەسەر چالاکی کوردایەتی، لەبەغدا گیراون. بەتێکەوتنی (قادر بەگی عیززەت بەگ) لای (عەبدولکەریم قاسم) بەردراون. ڕۆژی ١٩٦٣/١٢/١٣ لەبەغدا کۆچی دوایی کردووەو، هەرلەوێ نێژراوە[٤٢].

## گروپی شێخان

ڕەفیق حلمی، کە یەکێك بووە لەهاوکارانی (شێخ مەحمودی حەفید)و لەسەرنجدانی پەیوەندییە کۆمەلآیەتییەکاندا پیاوێکی وردبووە، بەم شێوەیەی خوارەوە باسی لایەنێکی تانو پۆی کۆمەلآیەتیی شاری سلێمانی، سەرەتای سەدەی بیستەمی کردووە:

((...لەبەر ئەمە ئەو موتەسەرفو سەرەك لەشکرانە کە لەسلێمانی بوون وەیا بۆی ئەنێرران بێ گومان لەنارو غەزەبی (شێخ سەعید) خۆیان ئەپاراستو ئەکەوتنە ژێر نفوزیەوە. هەندێك لەمانە، ئەگەیشتنە ڕادەیەکی ئەو تۆ کە بێ پرسو ڕای (حەفید) پەنجە نەکەن بەئاوا.

ئینجا گومانی تیانییە کە تاقمی مەئمورە بچوکەکان ئەبوون بەبازیچەیێکی شێخانو بەشی ڕەشۆکی ئەهالی بۆ قازانجو مەرامی کاری خۆیان بەبێ موچەو بەرات ئەچوونە ڕیزی نۆکەرو خزمەتکارانەوە. بەلآم دەستەی (تجار)و ئاغاکان دوژمنی ئەم خانەوادەیە بوونو لەژێرەوە (شیر)یان لێ ئەسوون))[٤٣].

سروشتی چینە کۆمەلآیەتییەکان ئەوەیە ، ئەگەر ڕێگە نەدرێن  بە ئاشکرا داواکارییەکانیان دەربڕن و بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان تەگەرەی بۆ دروست بکرێت، بەنهێنی هەوڵی خۆیان دەدەن و یان چاوەڕوانی هەلی لەبار و گونجاو دەکەن، بۆئەوەی پلانی خۆیان جێبەجێبکەن.

بەرەی شێخان یان گروپی شێخان یان بنەماڵەی بەرزنجی یان حەفید، هەر هەمووی ئاماژە کردنە بۆ یەك گروپ، کە پێش دروستبوونی شاری سلێمانیو پاش هەرەسی میرنشینی بابان، لەساڵی ١٨٥١ دەوری سیاسییو فەرهەنگی خۆیان هەبووە. ئەمان بەهۆی نزیکی نێوان هەردوو گوندی بەرزنجەو نۆدێوە لەپایتەختی پێشووی بابان (قەلآچوالان)، هەر زوو توانییان جێگەی خۆیان لەهەناوی ژیانی ئەدەبیو دینی پایتەختدا، بکەنەوە.

لەزۆرانبازی نێوان قادریو نەقشیدا (مەولانا خالیدو شێخ مارفی نۆدێ) لەوەدەچێ میرانی بابان لەدەوروبەری ساڵی (١٨٢٠)دا ویستبێتیان بەلانس لەنێوان ئەم دوو پۆلەدا ڕاگرن. هەر لەو ساڵەدا، پیری لاو نەیتوانی یان بەسوودبەخشی نەزانیوە درێژە بە بەربەرەکانێ لەگەڵ شێخی پیردا، بدات.

پەیوەندی نێوان (مەولانا)و (شێخ مارف)، کە سەردەمێك جیهانی ئیسلامی هەر لەبەغداوە تا ئەستەمووڵ دووکەرت کرد، هەندێ لایەنی لەپەیوەندیو ناکۆکی نێوان مارتن لووتەر (١٤٨٣ ـ ١٥٤٦)و تۆماس موینستەر (١٤٨٩ ـ ١٥٢٥) دەچێت. لووتەر ١٥١٧ز کەوتە هەڵوێستی بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ پاپاداو ڕۆمیش خوێنی حەلاڵ کرد. (تۆماس موینستەر) Thomas Münster سەرەتا دۆستو هاوڕێی (لووتەر) بوو، پاشان لەڕاپەڕینی جوتیاراندا (١٥١٧ ـ ١٥٢٥ز) ناکۆك بوون. (لووتەر) ئالای دوژمنایەتی جوتیارانی بەرزکردەوەو (تۆماس موینستەر)یش ئالای ڕاپەڕینی بەدەستەوە گرت تا ئەو ڕۆژەی لەبەردەم دەرگای شاری مدیلهاوزن هەڵدەواسرێت. (دەمەوێ لەنووسینێکی سەربەخۆدا لەسەر مەولانا خالیدو شێخ مارفی نۆدێ بنووسم)

بەڕۆیشتنی (مەولانا)و مەرگی کوتوپڕی ئەو لەشام، بەرەی شێخان لەو کاتەوە باڵادەستی خۆیان سەلماند. نووکی ڕمی خەباتی چینی بۆرجوازی لەئۆروپادا (شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩) بۆ نموونە) دژی دەسەلاتی مەلیكو کەنیسە بووە، لەئەمریکاو ئەڵمانیاو ئیتالیاشدا هاوپەیمانێتیو هاوسەنگەرایەتی لەنێوان چینی بۆرجوازیو کەنیسەو پیاوە ئایینییەکاندا نەبووە. لەماوەی نێوان (١٨١٠ ـ ١٨٢٠) بازرگانو کاسبکارو پیشەوەرانی شاری سلێمانی، لەبن عەبای سەرشانی پیری تەریقەتی نەقشبەندی خۆیان پاراستووە، دژی دەسەلاتی میرانی بابانو هاوپەیمانەکانیان. دیارە ئەمە نیشانەی لاوازیو بچووکی توانای ئابووریو

سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی ئەوان بووە. گەر بەهێزبوونایە بەشێوەیەکی ئۆتۆنۆم‌و سەربەخۆ کاریان دەکردو بەهاوبەشایەتی‌و هاوپشکایەتی رازی نەدەبوون.

پاش هەرەسهێنانی دەسەڵاتی بابان، چینی بۆرجوازی ئەوەندە ئەزموونی دەوڵەمەندی نەبوو، ئەوەندەش تەشکیلات رێکخستنی بەهێز نەبوو، رێکخستن‌و دامەزراوی خۆی هەبێت، تا هەلی لەناوچوونی دەسەڵاتی میرایەتی بابان بقۆزێتەوەو دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت.

گروپێکی کۆمەڵایەتی (ئایینی) پێش ئەوان کەوت، هەر بەخشکەیی، بەبێ شۆڕش‌و کودەتاو جوڵانەوەی چەکدارانە، دەسەڵاتی خۆی سەپاندو هەموو بەرهەڵست‌و بەرەنگاری سەرکوتکرد. ئەمانە بەڕەسمی لەناو دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانیدا، هیچ پلەوپایەو مەقامێکیان بۆ دیاری نەکرابوو، بەلام هەموو شتێ بوون.

پێش ئەوەی (شێخ مەحموودی حەفید) ساڵی (١٩١٩ تا ١٩٢٤) وەکو نوێنەری گەلی کوردستان بجووڵێتەوەو داوای مافی گەلی کورد بکات‌و ئاڵای سەربەخۆیی بەرز بکاتەوە، بنەماڵەی شێخان لەناوچەکەدا دەسەڵاتی سیاسی — دینی رانەگەێنرابوون. ڕاستە پێش ساڵی ١٩١٨ هیچ ئاماژەو نیشانەی هەستی نەتەوایەتی بەدی ناکرێت، پاش هاتنی ئینگلیز شەقڵی کوردایەتی دەردەکەوێ‌و (شێخ مەحموود) خۆی وەکو مەلیکی کوردستان ناو دەنێت‌و (تاجی شاهی) لەسەر دەنێت‌و رێگە نادات بە (دەستی مودەعی تاجی شاهی) لەسەربنێت، بەلام بەشداریی لەشەڕی شوعەیبە دژی هاتنی سوپای ئینگلیزی کردووە، لەژێر دروشمی (غەزا) بووەو بەدەنگەوە چوونی بانگەوازی خەلیفە بووە. لەماوەی نزیکەی ٧٠ ساڵ (١٨٥١ ـ ١٩١٨) بنەماڵەیەك لەسەر بنەمای ئایینی ـ عەشایەری دەسەڵاتی خۆی سەپاندووە. ئەم جۆرە دامەزراوە (ئینستیتووتسیۆن ـ Institution) بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت یان بزاڤێکی ناسیۆنالیستی گونجاو

نییە. هەر بۆیە ئەو جولانەوەیە لەسنووری ناوچەدا خۆی قەتیس کردووەو پەل‌وپۆی بۆ سەرانسەری خاکی نیشتمان نەکێشاوە.

(مەلا عەبدوللای زێوەر)* ، کە زۆر لە(شێخ مەحموود)ەوە نزیك بووە، بەم شێوەیەی خوارەوە دەنووسێت: (نەفسی شار بێجگە لەحکومەت پەنجا ئاغاو ساحێب حوکمی تیابوو، هەر مەحەللەیەك، بەلکو هەر سوقاقێك ئاغایەکی بوو. (شێخ مەحموود) کە چاوی کرایەوە، کەوتە دنیاوە، حوورپەتی تەبعی هەموو موعامەلەیەکی قوبووڵ نەدەکرد، دەستی کرد بەموقابەلەی ئاغایانی ناو شارو حیمایەی مەغدوورو بێچارە. وردە وردە ئەهالی ڕوویان کردە پەناو دەرگای ئەو. لەپاش یەك دوو ساڵ، هەموو مەحەللەی کانی ئاسکان‌و مەلکەندی‌و سەرشەقام‌و قیسمێ لەگۆیژەو دەرگەزێن بوون بەمەحسووب‌و خزمەتکارو مەنسووبی ئەو، حکومەتیش بەناو هەبوو. زۆر لەمەئموورانیش خۆیان هاویشتە باوەش بۆ مەحفووزبوون لەبەلای ناگەهانی‌و عەزل بوون، چونکە ئەیتوانی لای موتەسەریف یان والی ئەو مەئموورە ویقایە بکا).

بنەماڵەی شێخان، پاش دەرپەڕاندنی (مەولاناخالید)، وەکو هێزێکی کۆمەلایەتی کاروباری خۆیان هەلدەسووڕاند. مردنی (شێخ مارفی نۆدێ) ١٨٣٨و ناشتنی لەگردی سەیوان‌و مەرگی سلێمان پاشای بابان لەهەمان ساڵداو ناشتنی بەتەنیشت گۆڕەکەی شێخ مارفەوە، ناکرێ کاری ڕێکەوت بێت! دەتوانرێت لەئاوێنەی ئەکتێکی (act)** سمبۆلی‌و میتیۆلۆجییەوە بخوێنرێتەوە. ناشتنی دوو کەسایەتی (دینی)و (دنیایی) بەتەنیشت یەکەوە، کە ڕاستییەکی نەشاراوەیە، پیاوی (دنیایی) کورد، هیچ حسابێکی بۆ (پیاوی ئایین)ی نەکردووەو هەر یەکەیان لەشوێنێك نێژراون. میران، پاش مردنی (سلێمان پاشا) هەستی

---

* زێوەر: (سج) ل١٣٠

** ئەکت (act): کارێك یان فرمانێکی کۆمەلایەتی ـ سیاسییە.

سیاسیی‌و مێژوویی خۆیان هەبووەو هەستیان کردووە لەسەر دارو پەردووی دەسەڵاتی ئەواندا، ئەوە دەسەڵاتێك خەریکە لەدایك دەبێت‌و دەسەڵاتی ئەوان بەرەو ئاوابوون‌و تێکشکان دەچێت‌و بیانووی بوونی، خەریکە خۆی دەسڕێتەوە. ڕەزامەندی یەکسانیبوون، تەنانەت لەگۆڕستانیشدا، جۆرێك بووە، لەدان پێدانانی دەسەڵاتی ئایینی. ئەوەی ڕازیبووە باوکی بەتەنیشت پیاوێکی ئایینیەوە بنێژرێت، (ئەحمەد پاشای بابان) بووە، ((نالی)) بەبۆنەی کۆچی دوایی سلێمان پاشاو نیشتنە سەر تەختی میرایەتی ئەم شیعرە جوانەی گوتووە:

**تافەلەك دەوری نەدا ـ صەد کەوکەبی ئاوا نەبوو ـ**
**کەوکەبەی میهری مویارەك طەلعەتی پەیدا نەبوو**

تا دەگاتە کۆتایی:

**شاهی جەم جا ((نالیا)) (تاریخ جم) تەئریخیە**
**دا نەڵێن لەم عەصرەدا ئەسکەندەری جم جا نەبوو**

سەرهەڵدانی داوودەزگایەکی دینی، لەگەڵ قانوونی (بازاڕی ئازاد)دا گونجاو نییە. دامەزراوەکەی ئەوان، وەکو تۆڕێکی نهێنی نەبینراو بووە، ڕێگر بووە لەبەردەم گەشەکردنی بازاڕی چینی بۆرجوازی، کە دەیەویست بازاڕو ژیانی کۆمەڵایەتی‌و کولتوری‌و سیاسیی لەژێر کۆنترۆلی خۆیدا بێت. مێژوونووس‌و ڕووناکبیرانی کورد نەیانویستووە، لەسەر مێژووی بنەماڵەی شێخان بنووسن. لەناو ئەم بنەماڵەیەدا بێگومان دەیان نووسەر هەبوون‌و هەن، ئەوانیش ڕەنگە هەر پێیان باش بووبێت، تیشك بخرێتە سەر دەوری (شێخ مەحموود)

لەبزوتنـەوەی ڕزگاری گـەلی کـورددا، بـەبێ ئاوڕدانـەوە بـۆ دوو کەسـایەتیی زۆر گـرنگ لەمێـژووی شـاری سـلێمانیو میرنـشینی بابانـدا، مەبەسـت (شـێخ مـارفی نـۆدێو کـاك ئەحمـەدی شـێخ)ـە، کـە تـا ئـەمڕۆش بەشـێك لەخـەڵکی ئـەم شـارە بەگۆڕی (کاك ئەحمەد) سوێند دەخۆن.

نووسین لەسەر ئەم بنەماڵەیە، کاری ئـەم نووسینە نییـە. ئێمـە تـەنیا یـەك بڕگەی مێژووییو تەنیا یـەك ڕایـەڵ لەبەرچاو دەگـرین: پەیوەنـدی ئـەم گروپـە بەبازرگانو کاسبکارو ڕووناکبیرانەوە لەماوەی نێوان ١٨٥١ ـ ١٩١٨. هەر لەبەرئەوەی فاکتو دۆکۆمینتی زۆرم بەدەسـتەوە نییـە، ناچارم پـەنا بەرمـە بـەر شـیعرێکی بڵاونــەکراوەی (مــەلا حەمــدوون) (١٨٥٦ ـ ١٩٢٥)[٤٥] ئــەم شــاعیرە نابینایــە، هەڵوێـستێکی ڕەخنەگرانـەی تونـدی بەرامبـەر (شـێخان) هـەبووە. ئیـدی ئەمـە هۆیـەك بێـت، کـە خـەڵك وەکـو ڕێزێـك بـۆ شـێخ، کـەس بـەجوانی نـەزانیوە ئـەو ڕەخنەیە بڵاو بکاتەوە. من ئەوەی بـۆنی هـەجوی لـێ دەکـەم، مقەسـی سانـسۆرم خستووەتە ملیو قرتاندوومەو ئـەوەی بـۆ ئـەم نووسـینە تۆزێـك سـوودی هەیـە، ئەوە دوورو نزیك ئاماژەم بۆ کردووە.

شـیعرەکەی حەمـدوون، لەسـەر هـەمان کێشو سـەروای شیعرە پـڕ شـانازیو ستایـشەکەی شـاعیری داشـۆری (شـێخ ڕەزای تاڵـەبانی)یـە، بـەڵام بـۆ مەبەسـتی ڕەخنەو داشۆری جیهانی (شێخ ڕەزا)ی بەکارهێناوە:

**لەبیرم دێ سولەیمانی کە دارولمولکی بابان بوو**

**نە مەحکوومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو**

(مـەلا حەمـدوون)، لەگـەڵ (شـێخ ڕەزا)دا هـاوبیرو هاوبۆچـوون نـەبووەو ئـەو هەرچی گوتووە، ئەم پێچەوانەکەی بەڕاست زانیوە:

**لەبیرم دێ سولێمانی، (بەناو): بەرحوکمی سوڵتان بوو**
**وەکو شارۆچکەێیکی، پڕ (کەلاوە)و چۆڵو وێران بوو**

**لە (عەدلا) حوکمی عوسمانی (تەرازوو)یێ بوو (پەتپچڕاو)**
**بەناوی (دین)ەوە سوڵتان، خەلیفەی ئالی عوسمان بوو**

لەبری شانازی بەمێژووی ڕابوردووی پڕ لەسەروەری و شانازی، کەموکوڕی و خواروخێچیی حوکمی عوسمانی دەدرێتە بەر نەشتەری ڕەخنەو ناڕەزایی. شاعیر پێیوابووە، عوسمانییەکان، هەر بەناو ئیدارەی وڵات هەڵدەسوڕێنن، بەکردەوە بەرەی شێخان، لەپشت پەردەوە هەڵسووڕێنەرو داسووڕێنەرن و سەرجەمی ئیدارەو سوپا بەفەرمانی ناڕاستەوخۆی ئەوان بەڕێوە دەبرێت و سەری پەتەکان بەدەست دەسەڵاتی نەبینراوی ئەوانەوە بووە.

**(خەلافەت): ناوی گەورەو، شاری وێران بوو، لەواقیعدا،**
**(سەرا)و (قشڵە)و (ئیدارات) گشت (بەکردە) ماڵە شێخان بوو**

ئەگەر ئێمە زانیمان (سەرا)، جێگەی کاری (متصرف)ی موتەسەرفییەی سلێمانی بووەو (قشڵە): سەربازخانەو جێگەی حاکمی عەسکەری و هێزی چەکدار بووەو (ئیدارات)، چەمکێکە ئەمڕۆش ڕەنگە هەمان مانای دوێنێ بگەیەنێت، واتە: شوێنی ڕاپەڕاندن و هەڵسووڕانی کاروباری هاووڵاتییان یان (ڕەعییەت: بەگوێرەی پێناسەی قانوونیی تاک و شێوەی حوکمی سیاسیی).

(مەلا حەمدوون) لەدەوروبەری (١٩١٠ ـ ١٩١٤) ـ کاتی نووسینی شیعرەکە ـ گاڵتە بەدەسەڵاتی عوسمانی دەکات (ناوی گەورەو دێی وێران) بۆ (ناوی گەورەو شاری وێران) دەگۆڕێت، هەر بۆ ئەوەی خەڵك قەناعەت پێبکات، دەوڵەتی عوسمانی پەیکەرێکی قەبەو بەتاڵو هەر ناوەکەیە، ترس و لەرز دەخاتە دڵانەوە، بەکردەوەو پراکتیك گروپێکی کۆمەڵایەتی خۆماڵی دەسەڵاتی بەدەستەوەیە. هەرچی دەسەڵاتی ئیداریو مەدەنیو عەسکەری دەوڵەت هەیە، لەپشتەوە، بەنهێنی لەلایەن بنەماڵەی شێخانەوە، بەناڕاستەوخۆ بەڕێوە دەبرێت. ئەم بەیتە بەئاشکرا پێمان دەڵێت: بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتی لەچاو دەسەڵاتی بنەماڵەی شێخاندا، هەر زۆر لاوازو بێبایەخو پەراوێز کراو بووە. بەڕووکەش دەوڵەت باڵادەستیو هێزی خۆی پیشان دەدات، لەڕاستیدا گروپێکی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتی بەدەستەوەیەو ئەگەر حوکمڕانیش بکرێت بە (فیعلي) ئەوان دەیکەن، نەك دەوڵەت.

**بە ( داگیرکردن )و، ( زۆر )و ( ( نرخی جوزئی )، یا ( خوا هیشت )**
**بە ( خاقانی )، نەبوونە : ( موڵکی شێخ )، فەرمانی گوڵخان بوو**

**لەتاوانا، بەشی ( ئەشراف )و ( مەلاك ) ( زێد )یان جێهێشت**
**لەئەنجامدا ( مەقام )یان، دەوری ( کەرکوك ) یان ( ئێران ) بوو**

ئەم دوو بەیتە، یەکەمیان ئاماژەیە بۆ کۆکردنەوەی سامان بەڕێگەی زەبروزەنگو توندوتیژی. واتە: هەموو ڕێگەیەك گیراوەتەبەر، بەنیوە قیمەت بێت یان بەبێ هیچ نرخێك یان هەر زەبروزەنگی ڕووت بەکارهێنراوە بۆ فراوان کردنی دەسەڵاتی ئابووری. ئەم گوشارو تەنگ پێهەڵچنینە دژی چینی

ئۆرۆستۆکراتی (کۆن)و (ئەشراف)، کە دیارە توانای ئەوەیان نەبووە داکۆکی لەخۆیان و موڵك و سامانیان بکەن، ئیدی بەرەو کەرکوك و ئێران هەڵاتوون، بۆ ئەوەی ماڵ و موڵکیان دۆڕاند سەریشیان نەدۆڕێنن. گرنگیی ئەم بەیتە لەوەدایە بەراشکاوی ناوی (أشراف)ی وەکو چینێك هێناوە، کە ڕووبەڕووی چەوسانەوەو پاڵەپەستۆ هاتووەو دەسەڵاتی عوسمانیش نەیویستووە یان نەیتوانیوە داکۆکییان لێ بکات. گروپێکی کۆمەڵایەتی جێگەی گروپێکی تر بگرێتەوە، یەکێکیان بۆ سەرەوە هەڵدەکشێ و ئەوی تریان بۆ خوارەوە دادەکشێ:

**هەژار مرد لەبرسا یا بووە (دەربار) بەناچاری**
**بە (کارەکەر)، بە (کۆیلە)و چێشتکەری دیوانی ماڵان بوو**

ئەوەی تا دوێنێ لەخۆشی و شادیدا بووە، ئەوە هەموو ڕێگەیەکی ژیانی لێ گیراوەو ناچار کراوە بۆ دەرەوەی ناوچەکە کۆچ بکات. هەژارو نەدارو بەلەنگازیش، باری ئابووریان لەخراپەوە بۆ خراپتر داخزاوە. بەرامبەر ووشەی (کۆیلە) دەکرێ مرۆڤ ڕاوەستانێك بکات! ئایا هەر بەڕاستی (کۆیلە) وەکو چینێك یان پلەیەکی کۆمەڵایەتی ـ قانوونی هەبووەو لەبازاڕدا کڕین و فرۆشیان پێکراوە یان شاعیر بۆ مەبەستی ڕەوانبێژی ویستوویەتی ڕادەی گوزەران و بارخراپی هەژاران پێش یەکەمین جەنگی جیهانی پیشان بدات؟ کارەکەری و چێشتکەری وەکو دوو پیشە تا ئەمڕۆ لەکۆمەڵی ئێمەدا ماون. هەردووکیان بەرهەمی نەداری و دەستکورتین و بریا شوێنەواریان نەمێنێتەوە.

بەگوێرەی تێگەیشتن و بیروڕای شاعیر، دەبێ دەسەڵاتی شاراوەی شێخان بواری بەئازادی بیرکردنەوەو ڕادەربڕین و ڕەخنە نەدابێت. چکۆلەترین دەنگی ناڕەزایی سەرکوت کرابێت:

**کەسێ گەر خوانە خواستە بیگوتایە : ( لەل )، ئەبوو ( پەلپەل )**
**ئەیان گوت : ( فەرمەسۆن ) بوو، ( خەفیە ) بوو، ( شاگردی شەیتان ) بوو**

لەوە دەچێ ئەوساش وەکو ئێستا، هەڵوێستو بیروباوەڕی جیاواز (تەحەمول) نەکراوبێت بەخۆشییەوە سەیر نەکرابێت. دەسەڵات سزای مادیو مەعنەوی (زانگسیۆن ـ Sanktion)ی بۆ لادەران و ئەوانەی نەریتی کۆمەڵایەتی دەڕوشێنن، داناوەتەوە. ئەوەی گوتبێتی (لەل) بەدڕندانەترین شێوە (پەلپەل) کراوە. کەواتە: کۆمەڵی ئەو سەردەمە بواری بە (ئۆپۆزسیۆن)و جیاوازیکاری نەداوە. لەلایەکەوە سزای دەسەڵات (زانگسیۆن) جەستەیی بووە: لەش کراوەتە نیشانەی تیری (سزا)ی دەسەڵات. لەلایەکی ترەوە، مەکینەی گەورەی پڕوپاگەندەی ژەهراوی دژی بەرهەڵستکارو هێزی ئۆپۆزسیۆن خراوەتە گەڕ. سێ جۆرە تاوان خراوەتە پاڵ کەسانی سەربزێوو ڕەخنەگرو دژایەتیکەر.

١. فەرمەسۆن.

٢. خەفیە.

٣. شاگردی شەیتان.

ئەم سێ تاوانە، لەچاو جوێنی سیاسیی ـ ناسیاسیی ئەمڕۆدا تا ڕادەیەك پێشکەوتووترن. دەنووسم (جوێنی سیاسیی ـ ناسیاسیی) هەر بۆئەوەی خوێنەر بزانێت من بەمەبەستەوە ئەم چەمکە دادەتاشمو بزانێت ئەوە کارێکی دزێوی نازیاریو ناشارستانییە! ئێستا ئەوەی ڕەخنە لەلایەك بگرێت، ئەو لایەنە بەجوێنو قسەی ناشرین وەڵامی دەداتەوە. هەردوولا تاوانی ئەخلاقیو ناموسو باسی خوشكو دایكو عەشیرەتو تیرەو تایەفە دەخەنە پاڵ یەکتر. شاگردی شەیتان: یەکێکە لای شەیتان و لەفێرگەی شەیتان وانەی شەیتانایەتی خوێندبێت. شەیتان لەڕووی واتای زمانەوانییەوە بەرامبەر ژیرو زیرەكو زۆرزان دادەنرێت.

خەفیە: جاسوس و پیاوی دەزگای ئەمن و موخابەرات، ئەمە خراوەتە پاڵ ئەوانەی لایەنگیری گروپێکیان نەگرتووەو یان دژی ئەو گروپە قسەیان کردووە. دەمێنێتەوە چەمکی (فەرمەسۆن) کە ڕەنگە (مەلا حەمدوون) یەکەمین کوردی شاری سلێمانی بێت، بەنووسین یان لەشیعردا، ئەم زاراوە سیاسییەی بەکارهێنابێت.

پێویستە ئەو راستییە بزانرێت لەنیوەی دووەمی سەدەی (١٩)دا کە سەردەمی (ناصرالدین شاە)یە، لەبەشێکی شارەکانی ئێراندا لۆژی فەرمەسۆن پەیدابووە. کرماشان یەکێك بوو لەو شارانەی هەرزوو لایەنگیرانی (میرزا مالکۆلم)ی ئەرمەنی لقی فەرمەسۆن و (خاموشخانە)یان پێکهێناوە. تەنانەت شاعیرێکی شۆڕشگێڕی وەکو (ابوقاسم لاهوتی) (١٨٨٧ ـ ١٩٥٧)و باوکی (احمد الهامی کرمانشاهی) پێش ئەوەی تێکەڵاوی جوڵانەوەی مەشروتە ١٩٠٥ ـ ١٩٠٨ بێت و بەلای بۆلشەویك و کۆمۆنیستیدا باداتەوە، پەیوەندی لەگەڵ گروپە فەرمەسۆنەکاندا هەبووە[٤٦].

کارێکی ئاساییە، کە لەرێگەی کرماشانەوە یان لەرێگەی ئەستەموول و بەغداوە ووشەی (فەرمەسۆن) بەسلێمانی گەیشتبێت.

کاتی خۆی ئەلکساندەری دووەم، ئیمپراتۆری رووس بەدەستی خۆی نامە بۆ (ناصرالدین شا) دەنووسی و ئاگاداری دەکاتەوە «ئەنجومەنی نهێنی» دژی هەردووکیان کاردەکات. ئەویش هەر یەکسەر بڕیاری دوورخستنەوەی میرزا مالکۆلم دەدات. مالکۆلم، بەدەستبەسەری تا شاری خانەقی دەبرێت و لەوێ ئازاد دەکرێت. مالکۆلم، لەخانەقینەوە بۆ بەغدا دەچێت. ئایا ئەمە نابێتە هۆیەك کە هیچ نەبێت زاراوەکە لەم دەڤەرە بلاوبووبێتەوە، ئەگەر رێکخستن و تەشکیلات دروست نەبووبێت؟

فەرماسۆنەکان، داوای جێبەجێکردنی (قانوون)یان کردووەو لەتاران ڕۆژنامەی (قانوون)یان بڵاوکردووەتەوە... هتد. بەڵام لای ئێمە، ڕەنگە وەکو جوێن بەکارهاتبێت (کافری فەرمەسۆن)!

ئامرازی پڕوپاگەندە، کاریگەرێتی خۆی هەبووە لەدەمکوتکردنو تێکشکاندنی ئۆپۆزسیۆندا. دەسەڵات، تەنیا ڕاگەیاندنی ڕووتو ئامرازی پڕوپاگەندە بۆ پەلاماردانو هێرش بەکارناهێنێت، شان بەشانی ئەمانە زەبروزەنگو کوتەك لەپێشی پێشەوە دەبێت. دەسەڵاتی نوێ، کە لەسەر کەلاوەی میرنشینی بابان هەڵچنراوە، دوو پێگەی ئایینیو عەشایەریی هەبووەو پشتی بەجیهانی میتیۆلۆگیاو ئەفسانەو کەرامات بەستووە بۆ شەرعییەت پێدانی دەسەڵاتی بێسنووری خۆی. ئەم دەسەڵاتە ناڕەسمییە، لەدەرەوەی بازنەی پڕۆسەی بەرهەمهێناندا بووە، و هیچ بەشداری لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا نەبووە. لەڕێگەی چەکدارو نۆکەرانەوە، زەبروزەنگ بەکارهێنراوە بۆ دەوڵەمەند بوون لەسەر حسابی ئەوانەی بەرهەم هێنەرن. نوێنەرانی چینی بۆرجوازی، کە پێویستیان بەئاشتیو ئاسایش بووە، ناچار بوون، خۆیان پرچەك بکەنو بەرامبەر هەر زیادەڕۆییو دەستدرێژی، هێزی میلیشیا بجووڵێننەوەو وەڵامی دەستدرێژی بدەنەوە، بەشێکی تر بەچاکی زانیوە ڕووبکەنە (کەرکوك)و (ئێران) هەر بۆئەوەی بەئاسوودەیی لەوێ ژیانی ئابووری خۆیان بەسەر بەرن.

## بەراوردێکی ئەم حوکمەم، لەگەڵ حوکمی باباندا کرد
## خەجاڵەت ئەمگریێ ناڵێم: وەکو «ئاسمانو ڕێسمان» بوو

شاعیر، هەر زۆر پەستو بێزارە لەکردەوەو دەسەڵاتی ئەو بنەماڵەیە، نایەوێ ئەمان لەگەڵ حوکمی بنەماڵەی باباندا بەراورد پێ بکات، گەر لەدڵی خۆیدا

بەراوردو بەراوردکاری کردبێت، سنووری جیاوازی نێوان (ئاسمانو ڕێسمان)یشی تێپەڕاندووە، بۆیە گوتویەتی: (خەجاڵەت ئەمگری)! تەنانەت بە (ئاسمانو ڕێسمان) کە دوا پلەی جیاوازییە، ئەو ئەگەر بلێت، ئەوە خەجاڵەت دەیگرێتو ئەوپەڕی شەرمەزارییە. (مەلا حەمدوون) وەکو (سالم) لەسەردەمی بابانەکاندا نەژیاوە. وەکو (شێخ ڕەزا)ش هەندێ وێنەی جوانو سەرنجڕاکێشی بەهەشتی منالی بەگوڵو گوڵزاری بیرەوەرییەوە ئاوێزان نەکردووە. ئەم ئەگەر لە (١٨٥٦) لەدایك بووبێتو لەسێ چوار ساڵیدا، بینایی لەدەست دابێت، ئەوا دەبێ هەر لەڕێگەی بیستنەوە، دەنگوباسی بەسەرهاتی گەشو پرشنگداری لەکەسوکارەوە بەرگوێ کەوتبێت. ئێمە ئەگەر زانیاریمان لەسەر بنەماڵەو دەوروبەری شاعیر هەبێت، بەئاسانی دەتوانین ڕاڤەکاری بۆ هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی بەرامبەر گروپێکی کۆمەڵایەتی، بکەین.

## کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی ـ لقی سلێمانی

ساڵی ١٩٠٨، لەشاری سلێمانیدا لقێکی کۆمەڵەی (أتحاد وترقي) لەلایەن دەستەیەك بازرگانو فەرمانبەرو رووناکبیرەوە دامەزراوە. ئەندامانی ئەم لقە بەتایبەتی حاجی (ئاغا فتح الله چەلەبی) دەمراستی گروپەکە بووەو ئەو نامەیەی ماوەتەوەو کە لەکتێبەکەی کاك (کەمال رەئووف محەممەد)دا بڵاوکراوەتەوە ئاراستەی ئەو کراوە.

شۆڕشی مەشرووتە، کە لەلایەن کۆمەڵەی (ئیتیحادو تەرەقی) سەرکردایەتی کراوە، ڕۆژی ١٩٠٨/٧/٢٣ بەرپا کراو دەسەڵاتی گرتە دەست. مۆرەکەی لقی سلێمانی تاریخی ١٩٠٨/٧/١١ پێوەیە، واتە: تەنیا (١٢) ڕۆژ پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٩٠٨ کاتێك لەسەرانسەری دەوڵەتی عوسمانیدا، کۆمەڵەی (ئیتیحادو تەرەقی) لقوپۆپی دروستکردووەو پشێوی‌و ڕاپەڕین‌و تەقینەوە هەبووە، ئینجا نوێنەرانی بازرگان‌و کاسب‌و فەرمانبەرو ڕووناکبیران خۆیان لەناو گەورەترین ڕێکخراوی ئۆپۆزسیۆندا ڕێکخستووە. هەرچی چالاکی‌و جووڵانەوەیان هەیە، دەکەوێتە ماوەی پاش دەسەڵات گرتنە دەست ئەو ڕێکخراوەوە.

ئەم بەڵگانەی کە ساڵی ٢٠٠٤ لەکتێبێکدا[٤٧] بڵاوکراونەتەوە، یان ساڵی ١٩٩٨ دۆزراونەتەوەو لەسەریان نووسراوە، بەڵگەی لاوازی‌و بچووکی‌و کەمیی ژمارەی بازرگان‌و کاسب‌و فەرمانبەرانی چالاك‌و سیاسیی بەئاگایە، کە ویستوویانە دەوری ئۆپۆزسیۆن بگێڕن کە دژایەتی بنەماڵەی شێخانیان کردووە.

یەکەمین هەوڵی ئەمانە ئەوە بوو ،کە ئەندامە گرنگەکانی بنەماڵەی حەفید بەرەبەرە ڕەوانەی تاراوگە بکەن . داستانی کوشتنی (شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود) لەشاری موسڵدا ، لەئەنجامی پیلانێك بوو ، کە دوور نییە دەستی بازرگان و کاسبکاران.. (کاسبهای شەهری) تیا نەبووبێت، داستانێکی

بەناوبانگەو تاڕادەیەك، زۆری لەسەر نوسراوەو ڕەنگە لەئەرشیفەکانی شاری مووسڵدا زانیاری زۆرتر هەبن، کە دەستمان پێیان ناگات [٤٨]).

هەندێ نووسەری کورد پێیان وایە، کە بازرگانو ڕووناکبیران لەسەردەمی حوکمدارییەکەیدا جێگەی بڕوای (شێخ مەحمودی حەفید) نەبوون. ئەم گومانو دوودڵیو بێ بڕواییە بۆ کێشەی مێژوویی نێوان هەردوو گروپەکە دەگێڕنەوە، کە هەر لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمەوە بەشێوەی دوژمنانە سەریهەڵداوە. هەوڵو تەقەلای دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی لەساڵی ١٩١٨-١٩٢٤ لەسۆنگەی ناکۆکیو بەرەنگاری گروپێکی کۆمەڵایەتی چالاكو ئەکتیڤ، کە بەرژەوەندیو جیهانبینی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا نەدەگونجا، ئەزموونی ئەو کاتەی تووشی تێکشکانێکی زۆر سەخت کردووە.

هەروەکو چۆن بازرگانەکان لەلای خۆیانەوە هەموو ڕێگەیەکیان گرتووەتەبەر بۆئەوەی لەدەست زوڵموزۆری شێخان خۆیان دەربازکەن، شێخانیش هەموو ڕێگەیەکیان گرتووەتەبەر بۆئەوەی بازرگانەکان بەلای خۆیاندا ڕاکێشنو لەبن دەسەڵاتیاندا ورتەیان لێ بڕن. (میجرسۆن) بەم شێوەیەی خوارەوە باسی کردووە:

Shaikh Sa'id commenced a campaign of open robbery. Large sums of money were extorted from merchants without any pretext whatever and the prompt murder of the few who resisted these dements effectual intimidated the others. At the same time a policy of patriarchal hospitality and patronage was instituted. Any person presenting himself at the Schaik's house received food and became considered a retainer. In this way all the wrathless members of the population become adherents of the priests, and as many opened in the Bazaar, a new class of supporters arose which finally embraced nearly all the trades of Sulaimaniya .

((شێخ سەعید هەڵمەتێکی ڕاوو ڕووتی ئاشکرای دەستپێکرد. بڕێکی زۆری ئەو پارەو پولەی لەبازرگانەکان وەردەگیران بەبێ هیچ بیانویەكو دەست بەجێ کوشتنی ئەو چەند کەسەشی کە بەرەنگاری ئەم سەر شێتانەیان دەکرد، دەبووە هۆی تۆقاندنی ئەوانی دیکە. لەهەمان کاتدا سیاسەتی میوانداری باوك سالاری‌و سەرکردایەتی گیرایەبەر. هەر کەسێك کە خۆی بەماڵی شێخ دەناساند، بەخاوەن ماڵ لەقەڵەم دەدراو خواردنی دەدرایە. بەم شێوەیە ئەندامە لەسەرخۆکانی دانیشتوانەکە ببوونەگوێڕایەڵی (مەلاکان)و زۆربەیان لەبازاڕەکاندا بوون‌و چینێکی نوێی لایەنگران سەریان هەڵدا کە دواجار هەموو بازرگانەکانی سلێمانییان خستە ژێر چنگی خۆیانەوە)).

ئەم جیاوازی‌و ناکۆکییە، لەنێوان هەردوولادا، بەگوێرەی کارتێکردنی بارودۆخی ناوەوەو دەرەوە، لەخامۆشی‌و پەرەسەندندا بووە. ڕوون‌و ئاشکرایە گۆڕانکاریی سیاسی لەشارێکدا، ناتوانێ تاجی سەرکەوتن بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەسەر بنێت، ئەگەر شاروگوندەکانی تر بەدەنگییەوە نەچن، یان ئەگەر ئەو سەرکەوتنە، بەشێك لەسەرکەوتنی ئەو چینە لەسەرانسەری دەوڵەتێکدا نەبێت، بەگوڵێك نابێتە بەهار.

## جیهانی پیشەوەری

کاتێـك شـاری سـلێمانی دروسـتکراوە، گـەڕەکی جوولـەکان‌و گـەڕەکی گـاوران، لەقـەراخی شـاردابوون‌و لەگـەڵ گەڕەکـە موسـوڵمانەکاندا، تێکـەڵاو نـەکراون. یەکـەمیان: بەشـی ڕۆژهـەڵات‌و دووەمیـان: باشـووری شـار بـووە. صـابوونکەران بەهـەمان شـێوە کـەناری شـاربووەو تـا سـاڵانی چـلەکانی سـەدەی پێـشوو ئـەو شەقامەی ئێستا پێیدەگوترێت گۆران، (سەرووی ئۆرزدی) کێڵگەی پاقلەو گەنم‌و جـۆ بـووە. بەشـێکی تـری دوکـانی پیـشەوەرانی لەدەوروبـەری ئاشـەگواووی بـوو. بۆنموونە: ئاسنگەران‌و وەترافچی‌و موتابچی لەوێ بوون.

سەبارەت بەهێزو توانای ئابووریی پیشەوەران پێش ١٩١٤، زانیاری زۆر کەم‌و پەرش‌و بڵاومان بەدەستەوەیە. بەناوی گەڕەکەکانەوە (سابونکەران) دەزانین گروپێك لەم شارەدا هەبووە سەرقاڵی بەرهەمهێنانی سابوون بووە. چەخماخسازو قەزازو دەباغ‌و زێرینگەر هەبووەو بەهاتنی کاڵای ئینگلیزیی هەرزان، پیشەسازی‌و مانیفاکتۆرە، هەرەسی هێناوە.

بابەتێکی زۆر گرنگی تر، کەبە داخەوە تا ئەمڕۆ بە شێوەی ئەکادیمی هیچی لەسەر نەنووسراوە، پەیدابوون‌و بڵاوبوونەوەی مانیفاکتۆرەی جۆراوجۆرە لەناو شاری سلێمانی‌و دەروبەرەکەیدا. کۆنترین سەرچاوە لەوبارەیەوە نوسینەکانی (مارك سایکس)و (ئیدمۆندز)ە. کاك (ئەکرەمی ساڵحی رەشە)ش ناوی زۆریانی نووسیوە، بەبێ دیاری کردنی سروشتی کارەکەیان‌و ژمارەی کرێکارو هێزی ئابووریی ئەو مانیفاکتۆرانە.

(ئیدمۆندز) لەم بارەیەوە دەنووسێ: پێش یەکەم جەنگی جیهانی، سلێمانی بەمانیفاکتۆرەی چەك (چەخماخسازی) ناوی دەرکرد بوو. ئەم چەخماخسازانە، بەشێکی گەورەی پێویستی کوردستانی/ هەردوو دیوی سنووری ئێرانی، لەچەك، دادەپۆشی. (مارك سایکس) ساڵی ١٩٠٢ سەری ئەم شارەی داوە و پتر لە ١٥٠ دوکانی

چەخماخسازیی لێ بووە، کە لەڕووی چۆنایەتیشەوە، بەهرەمەندییان لەدروست کردنی جۆری چەکی مارتینی، نواندووە هتد[٤٩].

دەقە ئینگلیزیەکەشی بەم شێوەیە نوسراوە :

Before the was Sulaimani had been famous for the manufacture of the rifles with which a large part of Kurdistan on both sides of the Persian boundary was armed Mark Sykes (1902) mention that at the time of his visit there were no fewer than 150 competent gunsmiths turning out very creditable imitations of the Martini-Peabody. The craft gradually died out after our occupation but the cartridges continued for some time to be the standard weights used in the for weighing out groceries and other com modities.

((پێش ئەوەی سلێمانی ناوبانگ دەربکات بەدروست کردنی چەك کە بەشێکی گەورەی کوردستان لەهەردوو دیوی سنوری ئێرانی پێ پڕ چەك کرا، (مارك سایکس) (١٩٠٢) باس لەوە دەکات، کە لەمیانەی سەردانەکەیدا لە (١٥٠) چەخماخسازی بەتوانا زیاتری لێ نەبووە کە بتوانن بەباشی لاسایی (مارتینی - پیبۆدی) بکەنەوە. پیشەکە وورده وورده لەناوچوو دوای ئەوەی ناوچەکەیان داگیر کرد، بەڵام مەخزەنەکانی بۆ ماوەیەك هەر مایەوە کە وەك قەپانی سەوزە فرۆشەکان بەکاردەهێنران)).

کەمی زانیاری لەسەر جیهانی ئابووریی، دراوی‌و کارو کەسابەت ژمارەو ئامارو زانیاری لەسەر هەندێ توێژی کاسبکارو بازرگان‌و موڵکداران تۆمار کرابێت. خەڵکی کارامەو ئەو خەڵکەی لەدائیرەی ئەژمار (statistik) کار دەکەن، دەتوانن لەو ژمارانە بگەن‌و کۆمەڵی ئەو سەردەمەی پێ بخوێننەوە. ئێمە، ئەمڕۆش نازانین توانای دارایی‌و ئابووری‌و سیاسیی ئەو چینە پێش‌و پاش یەکەمین

جەنگی جیهانی چۆن بووە؟ ئەمەش هۆیەکە، کە کورد لەئەزموونی خۆی هیچ سوودێك وەرنەگرێت‌و مێژوو بەلایەوە چەند لاپەڕەیەکی زەردی هەڵپڕواوی ناو تاقە داڕوخاوەکانی بیرکردنەوەمان بێت.

ئەو زانیارییە پەرت‌وبڵاوە کەمەی کە تا ئێستا بڵاوکراوەتەوە، بایی ئەوە نییە وێنەیەکی ڕێك‌و پێکی ئەو سەردەمەی پێ بنەخشێنی‌و جیهانبینی‌و تێگەیشتن‌و ژیانی کۆمەڵایەتی چینی بۆرجوازیی پێ دەستنیشان بکرێت.

## زانیاریی گشتی

ئێمە ئەگەر لیستی باجدانمان دەست بکەوێت یان خشتەیەکی ئەژماری گومرگ یان ڕاپۆرتی ئەفسەرە ئینگلیزەکان، لەسالآنی پاش یەکەمین جەنگی جیهانیدا، ڕەنگە زۆر سوودیان لێ وەربگرین. ئەمانە هیچمان بەدەستەوە نیین، بەڵام دووسێ لیستی ئەو زەمانە بلاوکراونەتەوە.

ڕاپۆرتێکی ڕەسمی بەریتانی سەبارەت شاری سلێمانی لە (١٩١٩/٣/١٦) نوسراووە و پێشنیاری شارچۆڵکردنی تێداکراوە:

ئەم راپۆرتە کۆمەڵێك ڕاستی بایەخدار دەخاتە ڕوو سەبارەت زیانی شەڕ لەم شارەدا:

| جۆری بینا | ساڵی ١٩١٣ | ساڵی ١٩١٨ | ژمارەی وێرانبوو |
|---|---|---|---|
| مزگەوت | ٢٩ | ١٠ | ١٩ |
| تەکیە | ٣ | - | ٣ |
| خانەقا | ٢١ | ٢٠ | ١ |
| خانوو | ٣٢٠٥ | ١٣٢٩ | ١٨١٣ |
| حانووت | ٧٦٠ | ٣٣٨ | ٤٢٢ |
| چایخانە | ٣١ | ١٥ | ١٦ |
| حەمام | ١١ | ٦ | ٥ |
| ئاشی ئاو | ٢٤ | ١٩ | ٥ |
| باخ | ١٨ | ٥ | ١٣ |
| خان | ٢٠ | ١١ | ٩ |
| بازاڕ | ٦ | ٢ | ٤ |
| دوکانی بازاڕ | ٣٩٩ | ١٣٤ | ٢٦٥ |

کەمیی زانیاری لەسەر جیهانی ئابوریو دراویو کارو کەسابەتو بازرگانی، کۆسپێك بووە لەڕێگەی[50] نووسینی لێکۆڵینەوەی زانستیو مێژوویی لەسەر کۆمەڵی ئەوسای کوردستاندا. ئەم کەلێنە وای لەزۆر نووسەری کورد کردووە، کە بگەنە بڕوایەك، بۆرجوازی کوردی، وەك هەبوون، نەبووەو نییەو تەنیا سێبەری لەسەر نەخشەی بیرکردنەوەی ڕووناکبیراندا هەبووەو هەیە. بەلای ئەوانەوە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەم تا پێش جەنگی جیهانی یەکەم، چینێك لەکوردستاندا نییە چینی بۆرجوازی پێناسە بکرێت. چینێك بیەوێ بازاری نەتەوەیی یەك بخاتو داواکاری نەتەوەیی بەرزکاتەوەو خەبات بۆ ڕزگاری نیشتمانیی بکات[51]، واتە: ئەم کەلێنە فەرهەنگییە، کەلێنی کۆمەلایەتیو سیاسیی لێ بووەتەوە. هێزە سیاسییەکان نەیانتوانیوە دەستنیشانی ئەو هێزانە بکەن، کە بەرژەوەندی خۆیان لەرزگاربوونی نیشتمانەکەیان دەبینن.

بێگومان لەکتێبخانەو ئەرشیفخانەکانی بەغداو ئەستەمبولو تارانو لەندەندا بەلگەو دۆکۆمێنتی بایەخدار هەنو ڕووناکبیرو مێژوو نووسو کۆمەڵناسان دەتوانن بۆ ئەم مەبەستە سوودیان لێ وەرگرن. لەسەرای شاری سلێمانیدا ئەرشیفی زۆر گرنگ تا ساڵی ١٩٩١ پارێزراو بوونو ئیدی لەبن سێبەری ڕاپەرینی پیرۆزدا، بەلگەنامەیەکی یەکجار زۆر (ئەنفال) کران. دوور نییە لەڕێگەی ئەرشیفی شارەوانی، دادگا، تاپۆ... هتد. گەر بەشێوەی زانستی کۆبکرابانایەوە باشترینو جوانترین وێنەی ژیانی ئەو سەردەمانەمان دەستنەکەوتبایە.

گەر ئەم تابلۆیە ڕاست بێت، سەرژمێری دانیشتوانی شاری سلێمانی ساڵی ١٩١٤ (٤٠٠٠٠) هەزار کەس بووەو ئەوانەی دوکانو کۆگایان هەبووە ١١٥٩ دوکاندار بوون. ئەم ژمارەیە ئەگەر بێت ٣١ چایخانەو حەمام و ٢٠ی خان بخرێتە سەر، ئەوە هەمووی دەکاتە ١٢٢١ کەس، کە کاسبکار بوونو بەکاری سەربەخۆ ژیاون. بەگوێرەی ئەم ژمارەیە بێت، دەبینیین کە کاسبکاران لەڕووی چەندایەتییەوە

بەهێز بوون. ئەمانە وەکو دەزانرێت بەلای تەریقەتی نەقشبەندیدا دایانشکاندووەو تا ڕادەیەك خۆیان لەقادری نزیك نەخستووەتەوە. خەباتی بەردەوامی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیی بۆرجوازی ئەم شارە، لەبیرکردنەوەو ئاینیشدا ڕەنگیداوەتەوە. ئەگەر ژمارەی تەکییە، (کە شوێنی شێخو دەروێشانی قادرییە، سێ تەکییە بووە، ژمارەی خانەقا (٢١) بیستو یەك خانەقابووە (کە شوێنی شێخو صۆفی نەقشییە) واتە: خانەقا حەوت بەرامبەری تەکییەی قادری بووە. هەرچەندە شێخانی بەرزنجی لەساڵی ١٨٧٠ بەدواوە خاوەن دەسەڵاتی ئابووریو دینیو سیاسی بوون. بەخانەقا دروست کردن، دیارە چینی بازرگانو کاسبکار ویستویەتی خانەقای نەقشبەندی برەوی هەبێو پتر ڕەگ داکوتێو لەبواری ئاینییدا باڵا دەست بێت.

بەڕوواڵەت دەبوایە، هێزی دەسەڵاتداری ئابووری ـ سیاسی ـ دینی، دامەزراوەی جیاجیای زۆرتر بێت، بەڵام لێرەدا، هێزی (ئۆپۆزیسیۆن)، کە لەناو بازاڕدا باڵادەست بووە، توانیویەتی پارسەنگ، لەتەرازووی هێزدا دروست بکات. پۆل پۆلێنی ئایینی ڕەنگدانەوەی، ڕیزبەستنی چینو توێژە کۆمەڵایەتییەکانە لەزەمانی کزیی هۆشو نزمی ئاگاییو لاوازیی کولتوری سیاسیدا.

چینی بۆرجوازی ویستویەتی ئەو پەیامە بگەیەنێ، کە هەست بەچەوسانەوە و تەنگ پێ هەڵچنینو نادادپەروەری دەکاتو بەرامبەر ئەو ناعەدالەتییە، دەیەوێ دەنگی ناڕەزایی بڵند بکاتەوەو بێدەنگ نەبێ و خەبات بکات. ئەگەر قادریو نەقشبەندی جیاوازنو لەهەندێ سەردەمی پێشوتردا، جۆرە ناکۆکییەك لەنێوان دوو شێخو رابەری گەورە، دوو سمبۆلدا، هەبووە. دیارە پاش نزیکەی سەدەیەکیش لەڕۆیشتنی (مەولانا خالید) بۆ شام، بۆرجوازی کورد لەم شارەدا، خۆی بەو سمبولەوە گرێداوە، کە بۆنی ناڕازیبوونی لێوە هاتووە.

سەرەتای ساڵی ١٩٢٠ بە گوێرەی هەواڵێك لە رۆژنامەی پێشکەوتن (ژ-١- رۆژی ١٩٢٠/٤/٢٩) بلاوکراوەتەوە، چواردە بازرگانی ناودار بڕی (١٠٩٠) روپیە بۆ نۆژەنکردنەوە خانەقای مەولانا خالید کۆدەکەنەوەو حکوومەت (١٠٠) روپیەی داوەو حاجی مەلا محیالدین مەعروف بە تەنیا ئەوەندەی حکوومەتی بەخشیوە. هیچ بەلگەیەك سەبارەت پەیوەندی حاجی مەلا محیالدین بە رێبازی نەقشبەندیەوە بە دەستەوە نییە، بەلام خەرکردنەوەی پارە بۆ نۆژەنکردنەوەی رەمزێك لە رەمزەکانی ئەم تەریقەیە ئاماژەیەکی روونەو نیشانەی پەیوەندی نێوان بازرگانو رێبازێکی دینیيە.

دوو خاڵ هەن، کە دەبێ ئاماژەیان بۆ بکرێو خەڵکی تر وەلامیان بۆ بدۆزێتەوە:

هەندێ زانای کورد، ژمارەی خانەقاکانی سلێمانی پێش یەکەمین جەنگی جیهانی بەزۆر دەزانن. من ئەم پرسیارەم بەنامە ئاڕاستەی کاك (مەحەمەدی مەلا کەریم) کرد[٥٢] ئەویش نووسیبووی ژمارەکانی ناو ڕاپۆرتی بەریتانی ڕاست نینو تەنیا چوار پێنج خانەقا هەبوون (خانەقای مەولاناو خانەقای مەحویو خانەقای حاجی مەلا عەلی... هتد). ئەم جیاوازییە، دەکرێ سەرلەنوێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێو زانیاری وردتر لەسەر بابەتەکە بنووسرێت.

(مەولاناخالید) بۆ خۆی نامەیەکی ڕەوانەی (شێخ عەلی قازی) کردووەو گلەیی ئەوە دەکات، کە شاری سلێمانی، لەچاو شارەکانی تردا، هێندە لایەنگرو موریدی کەمە [٥٣]. ئەم نامەیە بەلگەیە لەسەر بوار نەدانو تەنگ پێ هەڵچنینو ئازادی بەربەست کردنی نەقشبەندییەکانی شاری سلێمانی، ئەمەش هۆیەکی گرنگی ماڵئاوایی مەولانایە لەپایتەختی میرنیشینی باباندا.

## بەراورد لەنێوان سلێمانیو کەرکوك

بەراوردێکی کورت هەر زۆر پێویستە لەنێوان سلێمانیو شارەکانی تری کوردستاندا. بەداخەوە ئێستا فاکتو ژمارەو زانیاری پێویست لەبەردەستدا نیین. خۆشبەختانە ساڵی ١٨٩٦ (شەمسەدین سامی) لە (قاموس الاعلام)[٥٤] هەندێ زانیاری پڕ بایەخی بڵاوکردووەتەوە: هەرچەندە ماوەی نێوان (قاموس الاعلام)و (راپۆرتە بەریتانییەکە) حەڤدە ساڵە، بەڵام بەراورد بۆ پێشکەش کردنی وێنەی باشتر لەسەر بابەتێك، هەریەکجار بەسوودە.

ئەوکاتە دانیشتوانی شاری کەرکوك، (٣٠٠٠٠) سی هەزار بووەو ١٢٨٢ دوکانو کۆگای تیادابووە. وەکو وتمان دانیشتوانی سلێمانی پێش یەکەمین جەنگی جیهانی ٤٠٠٠٠ کەس بوونو تەنیا ١١٥٩ دوکانو کۆگا لەو شارەدا هەبوون. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەگەر بەشێوەی رێژەیی بڕوانینە ژمارەکان، لەشاری کەرکوکدا، ژمارەی دوکان، لەچاو دانیشتواندا زۆرتر بووە. ڕەنگە کەمیی دوکان نیشانەی بوژاندنەوەی بارودۆخی ئابووری یان سەرقاڵبوونی بەشێکی کەمتری خەڵك بێت بەکشتوکاڵەوە.

لەسلێمانیدا، (١١) گەرماوو لەکەرکوکدا، (٨) گەرماوو لەهەولێردا، (١) گەرماو هەبوون، واتە لەسی هەزار کەس، (٣٣٠٠) کەس لەسلێمانیدا یەك گەرماویان هەبووە. لەکەرکوکیشدا، هەروا بووە. ئەم دوو ژمارەیە ئەوە پیشاندەدات، کە پاكو خاوێنی لەهەردوو شارەکەدا وەکو یەك بایەخی پی دراوە. بێگومان ئەو ڕاستیەش دەنوێنێ، کە کەم کەس خۆیان لەگەرماودا شتبێت یان لەماڵەوە خۆیان شتبێت یان زۆر کەم ڕوویان کردبێتە گەرماوی گشتی ئەگەر (٣٣٠٠) کەس دابەشی حەوت ڕۆژ بکرێت، ئەوە لەڕۆژێکدا تێکڕا (٤٨٠) کەس خۆیان شتووە. گەر حەمام دوانزە سەعاتیش گەرم کرابێت واتە: تێکڕا (٤٠) کەس خۆیان لەسەعاتێك دا شتووە. ڕەنگە، گەرماوەکانی سلێمانی ئەوەندە گەورە نەبووبن.

(کلۆدیوس ریچ) ستایشی گەرماوەکانی سلێمانی کردووە: ((ئەم بەیانییە چووم بۆ حەمامو، سەیرم کرد زۆر جوانو پاكو خاوێن بوو، زۆر باشیش ڕووناك کرابووەوە، کارگوزارەکانیشی باش بوونو، لەهەموو حەمامەکانی وڵاتی عوسمانی چاکتر بوو، کە هەتا ئێستا دیومن، جگە لەحەمامەکانی شامو ئەستەموولو قاهیرە، کە ئەمانە، لەهەندێ ڕووەوە لەوانیش باشتر بوون. دیوارەکانی بەڕەنگێکی بریقەدارو لەسەر شێوەی عەرەبی سپی کرابوون. پڕیش بوو لەحەوزو فوارە. ئەم حەمامە، لەلایەن میر ـ ی ئێستای سلێمانییەوە، دوو وەستای بەتایبەتی لەئێرانەوە لەسەر حسابی خۆی بۆ دروست کردنی هێنابوو. ئەڵێن شێوەی دروست کردنەکەی لەوەی کرماشان ئەچێت. هەروەها یەکێکی تریشی هەر لەسەر ئەم شێوەیە لەماڵەکەی خۆیدا دروست کردووە. موسڵمانەکان پارەیەکی زۆر لەحەمامدا خەرج ئەکەن، چونکە بەجۆرێك لەخواپەرستی ئەزانن، تەنانەت لەشکری دوژمنیش هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە زیان بەحەمام بگەیەنن. بۆیە بۆ ئەوەی بپارێزرێو لەناو نەچێ، وەقف ـ ی ئەکرێ[٥٥])).

ژمارەی مزگەوت لەکەرکوکدا (٣٦) مزگەوتو لەسلێمانیدا (٢٩) مزگەوت هەبووە. واتە: ژمارەی مزگەوت لەکەرکوك لەچاو ژمارەی دانیشتوانیدا زۆرتربووە. گەر کەسێك هەر لەخۆوە بڵێ: زۆری ژمارەی مزگەوت بەڵگەی زۆری خواپەرستییە، ئەوە هەڵەیەکی هێجگار گەورەیە. کۆنیی شار ڕەنگە هۆی ڕاستەقینەی زۆریی مزگەوت بێت. زۆری خەڵکی دەوڵەمەندی (بەدین) هۆی دروستکردنی مزگەوت بێت.

زۆریی خان لەخشتەکەی سلێمانیدا، بەڵگەی بەهێزبوونی چالاکیی ئاڵوگۆڕی کاڵاو کڕینو فرۆشتنی بەکۆ (جملة) بێتو زۆربەی کاڵاکان هی دەرەوەی شاربنو لەڕێگەی دوورەوە کاروان هێنابنی.

## توێژی دەوڵەمەندی بۆرجوازی

ئایاری ١٩٢١ لەعێراقدا، ڕیفراندۆمێك، سەبارەت بە دانانی فەیسەلی یەکەم بەمەلیکی عیراق کرا، مەرجی مافی دەنگدان ئەوە بوو: دەنگدەر دەبێ خانوویەکی هەبێ نرخەکەی لە (١٥٠) پاوەنی ئیستەرلینی (کە بەرامبەر ٢٠٠٠روپییە) کەمتر نەبێ. لەشاری سلێمانیدا، دوو هەزار موڵکدار هەبوون، کەنرخی خانووی هەر یەکەیان لە (١٥٠) پاوەن کەمتر نەبوو. لەم دوو هەزار کەسەدا تەنیا ١٩٠ کەسیان لەدەنگدانەکەدا بەشدارییان کرد. لەمانە ٣٢ کەس دەنگی بۆ ئەوەدا کوردستان بەعیراقەوە بلکێنرێتو (١٥٨) کەس دەنگیان دژی دا[٥٦].

ڕوداوێکی تر، ڕەنگە زۆر جێگەی سەرنج بێتو بۆنی هەوڵو تەقەلای گرێدانی کوردستان بەدەوڵەتی عیراقی لێوە بکرێت: کاتێك ئیدارەی بەریتانی لە (١٩٢٣/٦/١٤) شاری سلێمانی بەجێ هێشتو شارەکە سەرلەنوێ کەوتەوە دەست (شێخ مەحمودی حەفید)، نزیکەی (٢٠٠) کەس هەڵاتنو ڕەدووی سوپاو ئیدارەی ئینگلیز کەوتن، لەمانە (٣٢) کەسیان بازرگانی توتن بوون، کە ئەمانە دەمڕاستی کاسبکارو بازرگانەکان بوون. ئەمانە بەتوندی دژی سەربەخۆیی کوردستان بوونو لایەنگری گرێدانی کوردستانی باشور بوون بەدەوڵەتی عیراقەوە[٥٧].
نوێنەرانی بەریتانیاو دەوڵەتی نوێی عیراق، توانییان بەبەرزکردنەوەی دروشمی (توتنەکەتان لەکوێ دەفرۆشن؟) مێشکی بازرگانەکانی توتن، چەواشە بکەن. ئیدی ئەوانە وا چووبووە مێشکیانەوە کە دروستبونی دەوڵەتێکی کوردی کارو کەسابەتی ئەوان وێران دەکات.

ئەم دەستەیە لەبازرگانەکان، دەستەیەکی بەچەندایەتی بچوك، بەڵام لەڕووی ئابورییەوە بەهێز بوون. ئێمە نازانین سامانی ئەم گروپە چەندبووە؟ نازانین توانا و پەیوەندی ئابووریو داراییان چۆن بووە؟ بەڵام هەندێ شتی بچوك لەسەر ئەوان بەدەستەوەیە: تەنیا لەبازرگانی توتندا، شاری سلێمانی،ساڵانە (٢٠٠٠٠٠)

دوو سەد هەزار پاوەنی ئیستەرلینی زەریبەی ڕەوانەی خەزێنەی دارایی عیراق کردووە. ئەو زەریبەیەی کە بۆ توتن دەستنیشان کراوە ١٠٪ کۆی داهاتی ساڵانە بووە. واتە: داهاتی ساڵانەی بازرگانیی توتن لەشاری سلێمانیدا، بەلای کەمەوە دوو ملیۆن پاوەنی ئیستەرلینی بووە. هەروەها داهاتی ساڵانەی شاری سلێمانی، ساڵی ١٩٢٠ نزیکەی ٢٣٨٤٢٩,٤٦ پاوەن بووە (کە بەرامبەر ٣,١٧٨,٩٨٠ ڕوپیێیە)یە. داهاتی (نەتەوەیی) عیراق لەهەمان کاتدا ، (٣,٩) ملیۆن پاوەنی ئیستەرلینی بووە[٥٨]، بەشێك لەبازرگانەکانی شاری سلێمانی، لایەنگری ئیدارەی کوردی نەبوون، ئەم گروپە پێیانوابووە، گەر دەسەڵاتو ئیدارەی کوردی دامەزرێت، لەسەر سنووری کوردستان خاڵی گومرك بۆ هەناردەو هاوردە (صادرات و واردات) دادەنرێتو هەر کاڵایەك دەرچێت یان بهێنرێت، گومرکی دەخرێتە سەر. حکوومەتی عیراقیش گومركو باجو زەریبەی خۆی دەبێتو ئەمە ڕێژەی قازانج هەر زۆر بچووك دەکاتەوە. ئەو بەشە بازرگانەی سلێمانی، لایەنگری ئەوە بوون، تەنیا یەك گومركو یەك باج هەبێت، نەك دووان!

هیچ زیانێکی نییە، گەر خوێنەر ئەوەش بزانێ، کە (شێخ مەحمودی حەفید) ٣٠٠٠٠٠ سێ سەد هەزار پاوەنی ئیستەرلینیی هەبووە، جگە لە زەویو زارو مەڕو ماڵات[٥٩].

## تەرازووی هێزی ئابووری

لەقۆناغی پاش یەکەم جەنگی جیهانیدا، بەشی سەرەوەی بۆرجوازیی کورد دەیتوانی لەڕووی ئابووریەوە، شان لەشانی گروپە کۆمەڵایەتییەکانی تر بدات. کاروکەسابەتیان لەبرەودا بوو، دەیانتوانی داکۆکی لەخۆیان بکەنو هەوڵیان دەدا، لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە نیشانەی شان‌وشکۆو دارایی‌و خۆشگوزەرانی دەربڕن. ئیدی بەشێك لەمانە خاوەن دیوەخان بوون‌و لاسایی ئاغاوات‌و شێخانیان دەکردەوە، لەپێشوازی میوان‌و ناندان‌و چەکدارو پاسەوان ڕاگرتن (بۆدی گارد). ئەم چەکدارانە، هەندێ جار لەتوانایاندا بوو، کە لەگەڵ گروپە چەکدارەکانی تردا ڕووبەڕوو ببنەوەو سەنگەر لەیەکتر بگرن‌و پەلاماری یەکتر بدەن. ئەم گروپە چەکدارانە، چەند جارێك لەگەڵ چەکدارەکانی (شێخ مەحمودی حەفید)دا، کە لەنووسراوە ڕەسمییەکانی حکومەتی (شێخ مەحمود)دا بە (چەتە) ناویان براوە، تووشی شەڕوشۆڕو پێکدادانی چەکدارانە هاتوون.

بازرگانە دەوڵەمەندەکانی ئەم سەردەمە، لەچەند کەرتێکی ئابووری جیاجیادا، لەهەمان کاتدا، چالاك بوون. بۆ نموونە: (حاجی سەعید ئاغا)و ئەندامانی تری تایەفەی (ئاغا طه) خاوەن زەوی‌و زارو بازرگان‌و خاوەن خان‌و کاروان سەرا بوون. هەروەها لەڕووی سیاسیشەوە، بەشداری لەدەزگا سیاسییەکانی سەردەمی خۆیدا کردووە. لەسەردەمی عوسمانییەکاندا ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی سلێمانی‌و ئەندامی ( مەبعوثان)و لەسەردەمی ڕژێمی مەلەکیشدا، ئەندامی (مجلس الأعیان) بووە، کەواتە: چالاکی سیاسیی بازرگانەکان بۆ خۆپاراستن بووە. دروستکردنی میلیشیای چەکدار دیسان بۆ خۆپاراستن بووە. ئەوان توانیبێتیان شەڕو شۆڕ لەگەڵ هێزەکانی (شێخ مەحمود)دا بکەن، دیارە جۆرێك لەڕاگرتنی تەرازووی هێزی عەسکەری‌و سیاسیی‌و ئابووری هەبووەو لایەك نەیتوانیوە، لاکانی تر بەجارێك ڕامالێت.

## خوێندنەوەیەكی تر بۆ پیتاك

لەبەر بێ كەرەستەیی‌و نائاسانیی دەسكەوتنی فاكت‌و ئەژمار، ناچار بووم سوود لەگرنگی پیتاك خڕكردنەوە یان ( بار بوو) وەرگرم: لەولاتە ئۆروپیەكاندا، بەگشتی (بار بوو) شێوەیەكی شاردراوەی، نادیاری هەیە، ناوو ژمارەی حسابێكی بانكی لەڕۆژنامەیەكدا، یان لەرێگەی رادیۆو تلفزیۆندا بلاودەكرێتەوە. كەس كەس ناناسی‌و تەنیا هەستی مرۆڤانەو گیانی لێپرسینەوە پالپێوەنەرە. بەداخەوە لەرۆژهەلاتدا وانییە. پیتاك خڕكردنەوە هەندێ جار لە (شاباشی)ی دەهۆلچی‌و زورناژەن دەچێ. خەلك بۆ شانازی‌و كەش‌وفش‌و خۆدەرخستن‌و هەندێ جار بۆ خۆ هەلكێشان (بەخشیش) بەزورناژەن دەدرێت‌و ئەویش ئەوەندەی تر شاییەكە گەرم دەكات.

پیتاك، لەناو كۆڕو كۆمەلدا دەخرێتە سەر (سینی). پیتاككەر دەست بە ەرباخەلدا دەكات‌و چاوەڕوان دەكات، سەرجەمی كۆمەل بەئەویەری سەرسوڕمانەوە سەیری دەست‌و دل باشی‌و بەخشندەیی‌و گەورەیی ئەو بكەن. تا پارەكە زۆرتر بێت، دەم داپچڕان‌و چاو داپچڕانی ئامادە بووان گەورەتر دەبێت. ئیدی ناوی باشترین پیتاككەر دەكەوێتە سەر زاران‌و نێو شارانەوە. گەر ناوی پیتاككەر لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەكاندا بلاوكرایەوەو ئەو بڕەی پیتاكی كردووە بنووسرێ، ئیدی پیتاك شەقلی ئەكتی كۆمەلایەتی، ئاكارێك، كردارێك بەخۆوە دەگرێ، بۆ دەمەزەردكردنی ناوو ناوبانگ‌و شانازیكردن‌و ڕێز پەیدا كردن دەكرێ.

دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگیرێت (دەست‌و دلفراوان)ی لەبنەمادا بۆ ناوبانگ نییە، (حاتەم) پێش سەدان سال لەپێناوی ناو دەركردن، ئەسپەكەی سەر نەبڕیوە. خاوەن دیوەخان فرمانێكی كۆمەلایەتیی خۆی هەیە . سەرۆك هۆز، گەر دیوەخانی نەبێت، سەرۆك هۆزایەتی پێ نابڕێت. ناتوانێ كاری ئاسایی خۆی

جێبەجێ بکات. ئەو کەسە چەند چاوی بڕیوەتە بەرفراوانکردنی خەرمانەی سەرکردایەتی، دەبێت بەخشندەییو دەستو دڵ باشی، چاوەڕوانی دەوروبەرەکەی تێر بکات. ئەگەر چاوەڕوانی تێر نەکراو (حاتەم) میوانی بەبرسێتی لەدیوەخان بەڕێ کرد، ئەوە ناوبانگی ئەو بەسەر نەبڕینی ئەسپە خۆشەویستەکەی، بەبێ سەر لەبیاباندا بزر دەبوو، وەکو هەزاران ناو، وەکو هەزاران (حاتەم)و ناوی تر، کە لەی بیابان ناوو ناوبانگی هەڵلوشیون.

ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٨)، ت ٢ ساڵی ١٩٢٢ لیستی ناوی باربووکەرانی لەسەر لاپەڕەکانی خۆیدا بڵاو کردووەتەوە. ڕێکخەرانی پیتاك کۆکردنەوە، نیازی خۆیان خستووەتە ڕوو، کەدەیانەوێ بەو پارەیە (چاپخانە) یەك بکڕن، ئیدی نەنووسراوە چەندیان پێویست دەبێو لەکوێ دەیکڕن؟

لەوە دەچێ ڕێکخەرانی باربوو، کۆبوونەوەیان لەگەڵ خەڵکدا کردبێو یان داوای پارەتیان لەکەسانی دەست ڕۆیشتوو کردبێ، بەگوێرەی پلەو پایەی کەسایەتییەکان، ناوەکان لەسەر لیستەکە تۆمار بکرێت. بڕی پارەکەش نووسراوە. لیستەکە هەر زۆر بەوردی شێوەی ناو نووسینو پێناسەی کارو فرمانیان ڕەچاو کراوە. هەر بۆ نمونە: یەکەمین ناو: (شێخ قادری حەفید)ی برای (شێخ مەحمود)ەو سەرۆك وەزیران بووە (رئیس الرؤسا)، کە (٦٠٠) ڕوپییەی داوە. پاش (شێخ قادر) ناوی ئەندامانی کابینە نووسراوە. وەزیرەکان وەکو یەك دەوڵەمەند نەبوون. (شێخ حەمە غەریب)ی وەزیری ناوخۆ، (١٥٠) ڕوپییەی داوە، کەچی (مستەفا پاشا)ی وەزیری مەعاریف، (٥٠) ڕوپییەی داوە. نێوی قەسابو عەلافو بەقاڵ لەگەڵ نێوی وەزیرو سەرۆك هۆزەکاندا، پێکەوە نەنووسراون. دیارە ئەمە پاشماوەی خۆبەرز ڕاگرتنی چینی سەرەوەی کۆمەڵی ئەو سەردەمەیە.

بەگوێرەی ئەم لیستە، دەتوانرێ سەرو سیمای چەند گروپێکی کۆمەڵایەتی دیاری بکرێت. لەکۆی (٢١٥) پیتاککەر (١٠٨) کەسیان وەکو بازرگانو کاسب

دەناسرێنەوە. ئەو (١٧) کەسەی تر وەزیرو خاوەن موڵکی گەورەو فەرمانبەرو ئەفسەرو زانای ئاینیین. ساڵی ١٩٢٠ بەدواوە، لەخاڵی وەرچەرخانی مێژوویی دەچێت، ئەم وەرچەرخانە، تەنیا لەبواری ئابووری‌و سیاسیدا قەتیس نەکراوە، بەڵکو لەژیانی کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگیدا، رەنگی داوەتەوە. لەم سەردەمەوە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ سەرنجمان ڕادەکێشێ: ناوی بازرگان‌و بەقاڵ‌و قەساب‌و عەلاف شێوەیەکی ئاسایی وەردەگرێ‌و کەس پێی شەرم نییە وەکو خاوەن (پیشەی دەستی) ناوی ڕۆیشتبێ، لەوە دەچێ لای چینی سەرەوەی کۆمەڵ، هێشتا هەوری بیرکردنەوەی کۆچەرییان دەربارەی کاری پیشەوەری، نەڕەویبێتەوە.

لەم پیتاك خڕکردنەوەیەدا، خەڵکی نێو بازاڕو ئەهلی کارو کەسابەت، سنورێکیان بۆ بڕی باربوو داناوە (٥٠ ـ ١٠٠) ڕوپییە یان (٤ ـ ٨) پاوەنی ئیستەرلینی. بەڵام هەندێ نوێنەری چینی سەرەوە (ڕەقەمی قیاسی) یان داناوە. سەردەك وەزیران، (٦٠٠) ڕوپییەی داوە، (کەریمی فەتاح بەگ)ی سەرۆکی جاف، (٥٠٠) ڕوپییەی داوە. فەرمانبەرو ئەفسەرەکان هەریەکەیان (١٠ ـ ٣٠) ڕوپییەیان داوە.

(رأیس نافعە)، (محەمەد ئاغا)، واتە: (حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا) وەزیری (ئشغاڵ‌و ئیسکان)، کە پیاوێکی خاوەن زەوی‌و زار بووە دوو ئەوەندەی وەزیری (مەعاریف) (مستەفا پاشای یامولکی) باربووی کردووە.

## پیتاك كۆكردنەوەی دووەم

بۆ تێگەیشتنی ڕەفتارو كردەوەی كۆمەڵایەتی پێویستمان بەڕووداوێك هەیە، كە ژمارەیەك تاك‌و گروپ بەشدارییان تێدا كردبێت‌و هەر یەكە بەشێوەیەك جووڵابێتەوەو هەڵوێستی دەربڕیبێت. ئێمە سەرنج‌و تێبینی خۆمان دەربارەی كۆكردنەوەی پیتاك بۆ كرینی مەكینەی چاپ ساڵی ١٩٢٢ نووسی.

چوار ساڵ پاش ئەم ڕووداوە، ڕووداوێكی ڕووناكبیری ـ كۆمەڵایەتی ـ سیاسیی ڕوودەدات، كە دامەزراندنی (جەمعیەتی زانستی كوردان)ە. لەڕۆژی ٣/٤/١٩٢٦ ئاهەنگێك بەم بۆنەیەوە دەگێڕدرێت‌و هەر لەو ئاهەنگەدا گوتار دەخوێنرێتەوەو پیرەمێرد شیعرێك دەڵێت‌و پیتاك كۆدەكرێتەوە:

{امجار كوتنه دست پیشكری اعانه هركه مقداریكی معاونت فرمو (كه اویش بەجوی یكه یكه انوسری)}[٦٠].

كەواتە: ئەم باربووە تەنیا لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە نەبووە، بەڵكو لەناو گەرمەی ئاهەنگێكدا كراوە، كە نزیكەی (٣٠٠) فەرمانبەرو سیاسیی‌و بازرگان‌و ڕووناكبیری كوردو ئەفسەری بریتانی ئامادەبوون. لەناو ئەو ئاهەنگەدا پێشنیاری پارە كۆكردنەوە كراوەو هەر بە بەرچاوی ئەوانەشەوە جێبەجێكراوە. لەشوێن‌و بۆنەی ئاوادا، گروپەكان دەكەونە جوڵانەوەو پێشبڕكێ لەدەربڕینی دەست‌و دڵ باشی‌و گەورەیی‌و بەخشندەیی، كە لەهەل‌ومەرجی جیاوازدا، ڕەنگە لەدەست زۆر كەس نەیەت، ئەگەر بەبەرچاوانەوە نەبێت‌و كەس دیار نەبێت بەشداری لەباربوو، بەگەورەترین‌و بڕە پارە، نواندنی كێش‌و قورسی كەسایەتی دەوری تاكە لەپەیژەو هەرەمی كۆمەڵایەتیدا. یەكێك دەتوانێ لەسەر كەسایەتی‌و بیركردنەوەی بەشداریكەرانی ئاهەنگەكەو پیتاككەران بنووسێ، من لایەنی سیاسیی‌و بیركردنەوەو هەل‌و مەرجی كارەكەم بەلاوە گرنگ نییە، تەنیا بڕی پارەو شوێن‌و مەقامی كۆمەڵایەتی پیتاككەرانم بەلاوە گرنگەو دەمەوێ لەو

جغزەوە بڕوانمە بارودۆخو پەیوەندی کۆمەڵایەتیو تێگەیشتنی ئەو خەڵکە بۆ ئەرکو فرمانی خۆیان.

زۆرو کەمی پارەی (باربووکراو)، جێگەو مەقامی پیتاککەران پیشاندەدات لەناو کۆمەڵدا. بۆیە هەر یەکە لەبۆنەی ئەوتۆدا هەوڵدەدات ناوبانگ بخاتە مەلەو بەرزترین پلەی رێز داگیر بکات. پیتاککەر، دەیەوێت بەبەشداریکردن (رەصید)ی خۆی زیاتر بکاتو دەسکەوتێکی (مادی یان مەعنەوی) وەدەستبهێنێت، کە رەنگە سەرفکردنی چوار ئەوەندە پارەش، ئەگەر لەشوێنی تردا بێت ناوی ئەوەندە نەدرەوشێنێتەوە.

(ئەحمەد بەگی تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی) (١٨٩٨ ـ ١٩٦٣)، کە ئەو کاتە موتەسەریف (پارێزگار)ی سلێمانی بووە، دەستپێشکەریی لەدامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە کردووە. لەوەدەچێ یەکەمین کەس بووبێت، کە دەستی بەبنباخەڵدا کردبێتو باربووی کردبێت. ناوی ئەو، لەسەرووی ناوی پیتاککەرانەوە نووسراوەو (١٥٠) ڕوپییەی داوە. دووەم کەس (کاپتن لاین)ە، کە ئەو کاتە پشکێنەری ئیداری (موفەتشی ئیداری) بووەو (١٥٠) ڕوپییەی پێشکەش کردووە.

ناوی (حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا)، کە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەکە بوو، لەلیستەکەدا پێنجەمەو بڕی (٢٠٠) ڕوپییەی داوە، ئەمە گەورەترین بڕە پارەی باربووکراوە، کە لەلیستەکاندا بەدی دەکرێت. ئەم وەکو ئاماژەمان بۆ کردووە لەحکوومەتی شێخ مەحموودی حەفید ١٩٢٢، کە وەزیری (نافیعە) تەنیا (١٠٠) ڕوپییەی پێشکەش کردووە. لێرەدا (رقم قیاسی) داناوەو کەس نەیویستووە بیشکێنێ.

لەم لیستەدا، ناوی (شێخ قادری حەفید) بەدی دەکرێت، کە بڕی (١٠٠) ڕوپییەی پیتاك کردووە، کەچی لەساڵی ١٩٢٢دا بڕی (٦٠٠) ڕوپییەی داوە. ئەو کاتە ئەو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران (رئیس الرؤساء) بووەو (رقم قیاسی)

داناوەو دیارە بەجوان دانەنراوە، یەکێکی بەقاڵ ڕەقەمێکی گەورەتر پێشکەش بکات. لەحەملەی دووەمی پیتاککۆکردنەوەدا ئەو بڕە پارەیەی شێخ قادری سەرۆك وەزیرانی پێشوو، باربووی کردووە، بۆ شەش یەك دابەزیوە. (حاجی مەلا محی‌الدین) لەژەمی یەکەمی پارە خڕکردنەوەدا تەنیا (٥٠) ڕوپییەی باربوو کردووە، کەچی لەهەڵمەتی دووەمدا (١٠٠) ڕوپییەی پێشکەش کردووە. دیارە (حاجی مەلا محی‌الدین) لەجاری یەکەم بەنابەدڵی پیتاکی کردووەو جاری دووەم پتر هاتووەتە پێشەوەو یارمەتی کۆمەڵەی زانستی داوە.

لەلیستی دووەمدا، کە جاران ناوەکەی لەسەری سەرەوەی لیستەکەدا بووە، ناوی ژمارە (٢٠) (شێخ قادری حەفید)ە. لەژێر ناوی ئەو، ڕاستەوخۆ ناوی (حەپسەخانی نەقیب) نووسراوەو نیوەی مێردەکەی (٥٠) ڕوپییەی داوە. پێش (حەپسەخان) ناوی (گوزیدە یامولکی) نووسراوە، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچان بووە. ئەمیش ناوی لەبن ناوی مێردەکەی (عەزیز یامولکی)دا نووسراوە.

ژن و مێرد، هەر یەکە (٥٠) ڕوپییەیان پێشکەش کردووە. دیارە ئەمە جاری یەکەمە لەکۆڕو کۆمەڵی سلێمانیدا، ژن بەشداریی لەچالاکی ڕووناکبیریی - سیاسیدا بکات. لەوەدەچێ ژن، بەتایبەتی ئەم دوو خاتوونە لەئاهەنگەکەدا بەشدارییان کردبێت. حەپسەخانی نەقیب، ئەو زەمانە کەسایەتییەکی زاڵ و دەستڕۆیشتوو بووەو بەدووری نازانم ئەو لەوێ بووبێت. (گوزیدە یامولکی) ژنێکی ڕووناکبیرو هۆشیارو نووسەرێکی چاوکراوەبووە. ئەو ڕەنگە بەیەکەم ژنی (فیمینیست) دانرێت و نووسینەکانی جێگەی بایەخ و لێوردبوونەوەو ڕامانن لەم ڕووەوە[٦١].

ئەم ژنە لەبن کاریگەرێتی بیرو هۆشیاریو ئاگایی خۆیدا وەکو بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچان و یەکێك لەوانەی ژیانی فەرهەنگیو کۆمەڵایەتی ئەستەمووڵی بینیوە، جگە لەدەوری هاندەرو کارتێکردنی (عەزیز یامولکی)، بەدووری نازانم

خـۆی دەستپێـشکەری نـەکردبێت بـۆ بەشـداریکردن لـەو ئاهەنگـەدا. هەرچـی (حەپسەخانە) لەوە دەچێ وەکو ژنێکی دەسەڵاتداری خاوەن بڕیارو پەیوەنـدیی‌و رەنگە لەهەندێ بواردا، پـێش (شـێخ قـادر) کـەوتبێت‌و دەستپێشکەری کردبێـت. ئەو لەزۆر پیاوی بنەماڵەی شێخان ناسراوترو ناوی لەپێشترە.

## دۆزینەوەی ستراکتووری کۆمەڵایەتی

ئەم لیستەیە، سودێکی تری یەکجار زۆری بۆ کۆمەڵناس‌و مێژوو نووسان هەیە. لەم لیستەیەدا وەکو پێشتر باسمان کرد، کارو فرمانی پیتاککەران تۆمار کراون. جگە لەکابینەو گروپی کاسپکاران، ئاماژە بۆ هەندێ (یەکە)ی بەڕێوەبەرایەتی کراوە:

- کاتب مهندسخانە
- سرمحاسب مالیە
- سرکاتب داخلیە
- رئیس اجرا
- مدیر ایتام
- مدیر طابو
- سرکاتب رسومات
- کاتب دەیك
- مدیر مطبعة
- مأمور تلغراف

ئەم کارانە، پێویستیان بەپێناسەو لێدوان هەیە. ڕەنگە بەشی زۆری وەچەی ئەمڕۆ نەزانێ (کاتب دەیك) یان (رئیسی ئیجرا) چی بێت؟

ئەگەر یەکە بەیەکەی ئەم (یەکە) ئیدارییانە ڕوون کرانەوە، ئەو دەمە هەیکەلی حکومەتەکەی (شێخ مەحموود)یش وەکو دامەزراوەێکی سیاسیی - ئیداری لەبەرچاو دەبێت. مێژوونووس‌و ڕووناکبیر، هێشتا وەڵامی ئەو پرسیارەیان نەداوەتەوە: چۆن دەزگاکانی حکومەتی (شێخ مەحمود) کاریان کردووە؟ ئەگەر بەشێك لەخانووەکانی بەڕێوەبەرایەتی (یەکە) ئیدارییەکان بدۆزرێتەوەو لەسەریان لێتۆێژینەوە بکرێت، ئەوا خزمەتێکی گەورە بەمێژوو

دەبێت. من کاتێك لەسەر ئەم خاڵە دەنووسم قسەیەکی ڕەحمەتی (سەدیقی حەیدەریم) بیر دەکەوێتەوە.

ساڵی ١٩٨٥ چاوم پیێ کەوت ولێم پرسی: کابینەی حکومەتی کوردستان (کۆماری مەهاباد) لەکو ێ بوو؟ چۆن کاری دەکرد؟

ئەو گوتی: "هەموو وەزیرەکان لەساڵۆنی حیزب دادەنیشتن، هەر وەزیرێك مێزو کورسی خۆی هەبوو. (قازی مەحمەد)یش هەر لەوێ دادەنیشتو مێزو کورسی خۆی هەبوو". ئیدی خوێنەر خۆی دەبێ دامەزراوەی کابینەی کۆماری کوردستان بهێنێتە بەرچاوی خۆیو بەراوردێك لەنێوان ئەم کابینەیەو کابینەی ولاتی تردا بکات. بەهەرحاڵ، نووسین لەسەر ئینستیتووتسیۆن (مؤسسات) بابەتێکی سەربەخۆیەو لەم نووسینە کورتەدا، دەربارەی بۆرجوازی شارێك، جێگەی نابێتەوە. لێرەدا تەنیا ئاماژەیەکی کورتو خێرا بۆ ئەم دۆخە دەکەم، هەر بۆ هاندانی گۆڕاندنی ئاکاری گۆشە نیگای نووسینو لێکۆڵینەوەی دوا ڕۆژ.

ساڵی (١٩٩٥) سەرێکی رەحمەتی (ئەحمەد خواجە)مدا. ویستم یەکەمین جار بەدرشتی هەندێ زانیاریی لێ وەربگرمو پاشان گفتوگۆکە بەڤیدۆ تۆمار بکەم. (ئەحمەد خواجە) پیێ ووتم: هەرهەمووت بەرێکوپێکی بۆ دەنووسمەوە. داخەکەم نەمن پرسیارو وەڵامەکەم تۆمار کردو نەئەویش لەسەر بابەتەکە توانیی شتێ بنووسێ. بەهەرحاڵ من سەبارەت (مؤسسات)ی زەمانی (شێخ مەحمود) پرسیارم لێ کرد، ئەویش وەڵامی دامەوە، کە ناوەڕۆکەکە ئەمەی خوارەوەیە:

(١) **سوپا سالار**: شێخ قادری حەفید.

لەخانووەکەی (حەمە ئەمین بەگ) بوو. دووسێ ژوور، بوو شەقامی ئۆرزدی.

یاوەریەکەی: (جەمال بەگ جاف) بوو.

(١) **وەزیری داخلیە:** شیخ حەمە غەریب (زاوای شێخ مەحمود).
لەفێرگەی فەیصەلییە ـ (شێخ مەحمودی حەفید)یش لەهەمان بینایە بوو.
یاوەر (عبدالله ئاغای سەرشەقامی) (عبدالله سعید حەمە ئاغای پشتدەری).

(١) **وەزیری مالیە:** کەریم ئەلەکە (رسوماتی کۆدەکردەوە).
یاوەر: سالّح پاشا.
حەمە بەگی قادر پاشا.
مالییەش هەر لە فەیصەلیە بوو. ئەم فێرگەیە دە ژووری هەبوو.
(١) **وەزیری نافیعە:** حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا.
یاوەر : ماجید مستەفا.
قادر سعید (قالەی ئایشەخان).
(١) **وەزیری مەعاریف:** مستەفا پاشای یامولکی.
بارەگای وەزارەت: لەماڵەکەی خۆی لەصابوونکەراندا بوو، بەرامبەر حەمامی (موفتی) چوار ژووربوو.
یاوەر: رەشید ئەفەندی کابان.

(١) **بانگی کوردستان:** چاپخانەکە، بەرامبەر ماڵی (حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا) لەبەرئەوەی بازرگانەکان گەنمیان شاردبووەوە، (شێخ مەحمود) بڕیاری دەرکرد وەزیری نافعە چاودێری بازاڕ بکات. لەدوکاندارەکان ڕسومات بۆ خەزێنە وەردەگیرا.

*پرسیاری ئەوەشم کرد: موچەی وەزیرێك چەند بوو؟*

*کەریمی ئەلەکە بۆ نمونە موچەی وەرنەدەگرت.*

**(ساڵح پاشا) موچەی مانگانەی (١٥٠) روپییە بوو.**

ئەمە تەنیا زانیارییەکانی (ئەحمەد خواجە)ن. کەسانی تر دەتوانن لەڕێگەی نووسینەوەی ژیاننامەی کەسایەتی جیاجیاوەو لەڕێگەی وەسفکردنی شێوەی کارو بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوەکانی ئەو زەمانە وێنەی نوێ پێشکەشی مێژوو بکەن. کاکە (ئازاد عبدالواحد) توانیی لەسۆنگەی ساغکردنەوەی دیوانی (شێخ نوری شێخ ساڵح) زۆر دیکۆمێنت لەنەمان ڕزگار بکات. خۆزگایە رووناکبیران پەیڕەوی ڕێبازەکەی ئەویان بکردایەو کاری مێژوونووسیان ئاسانتر بکردایەتەوە.

## ڕووناکبیری بێ پڕۆژە، یان پڕۆژەی بێ ڕووناکبیر

دەوروبەری ساڵی ١٩٢٠ لەناو شاری سلێمانیدا، نزیکەی (٧٠٠) ئەفسەرو فەرمانبەرو ڕووناکبیری لێ بووە، لەم (٧٠٠) کەسە نزیکەی (٤٠٩)یان ئەفسەر بوون. ئەم گروپە لەڕووی بنەماڵەو ئاستی خوێندنو جیهانبینیو بۆچونی سیاسییو کۆمەڵایەتییەوە، ناتەباو جۆراوجۆرو هێترۆگین (HETROGEN) بوون. هەر بەشەیان لەئاوازێکی دەخوێندو لەئاشێکی دەکرد: بەشێکیان پشتیوانی بزاڤەکەی (شێخ مەحمود)یان دەکردو بەشێکی تریان دژی جوڵانەوەکە بوون. بەشێك هێشتا دەستی لەچاکی کەوای شۆڕی سەڵتەنەتی عوسمانیو پاشان تورکخوازەکان بەرنەدابوو. بەشەکەی تریان هەر هەموو هێلکەکانی لەناو سەبەتەی سیاسەتی ئینگلیز هاویشتبوو.

بەشێکی ئەفسەرو ژەنەراڵەکان بیرو باوەڕێکی تێکەڵو پێکەڵیان هەبوو (شاپەرستی ـ سلطنت طلب، ئیسلامی، ناسیۆنالیستی)و بەئەوپەڕی توندی دژی کەمالیستەکان بوون، کەلەسەر پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانیدا هەوڵیان دەدا، دەسەڵات دروست بکەنو هێز پێکەوە بنێن. ژەنەراڵ مستەفا پاشای یامولکی (١٨٦٨ ـ ١٩٣٦) دیارترین نوێنەری ئەم گروپە بوو. ئەو لەحکومەتەکەی (شێخ مەحمودی حەفید)دا، پۆستی وەزارەتی مەعاریفی پێ دراو سەرنوسەری ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) بوو. ئەو لەو سەردەمەدا پێی وابوو، کەدەبێ کورد لەگەڵ ئینگلیزدا پێك بێت و بەهۆی یارمەتی بەریتانیاوە دەوڵەتی کوردستان دروست بکرێت .

گروپێکی تری ئەفسەران لەجیهانبینیو بیری گروپی ڕووناکبیرەوە نزیکتر بوون، تابیری عەسکەریتاری سەربازیو سوپا پێکەوەنانو مەشقکردنو سەنگەر هەڵکەندنو پلانی هێرشو پەلامار... هتد.

ئەمانە وەکو ڕووناکبیران لەناو کۆڕو کۆمەڵدا کاری هۆشیاریو ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕی نوێیان دەکرد. ئەمانە لایەنگری گۆڕانکاریی سیاسیی ڕادیکال بوون. لەگەڵ هێزە کۆنە پارێزەکان دانوویان پێکەوە نەدەکولا. ئەمانە لەناو خەڵکدا بە (بەلشەویك) ناویان ڕۆیشتبوو، پڕوپاگەندەی ژەهراویان لەدژ دەکرا.

دەنگوباس هەیە، گوایە مەلایەك فەتوای لەدژیان دەرکربێتو خوێنی حەلاڵ کردبن، جەمال عیرفانو عارف صایب، کە هەردووکیان، بەگوێرەی نەخشەیەك تیرۆر کران، ناسراوترین نوێنەری ئەم تەیارەن. بەم تیرۆر کردنە هێزە کۆنە پارێزو ڕاستڕەوەکان توانیویانە دەمی"چەپڕەوەکان" داخەنو بوار نەدەن کەسی تر ئالاکەیان بەرز بکاتەوە[٦٣].

یەکێك لەو ڕووناکبیرانەی ئەو سەردەمە، کەسەردەمێك لەباڵی (جەمال عیرفان)و (عارف صایب)ەوە نزیك بووەو پاشان هەڵوێستی خۆی گۆڕییەوەو زۆر لە (شێخ مەحمود) نزیك بووەتەوەو جێگەی بڕوای بووە (ڕەفیق حلمی)یە، ئەو بەم شێوەیە لەیاداشتەکانیدا باسی ڕووناکبیرانی کردووە:

((بەلام ڕێکەوتنی تاقمی دەوروپشتی حوکمدارو ئەمانەی تر نەئەگونجاو تاقمی یەکەم لەبەینی حوکمدارو تاقمی دووەمدا لەخەنجەرو دەمانچە دیوارێکی دروست کردبوو. ئەگەر حوکمدار خۆی بیویستایە، ئەم دیوارەی ئەڕووخاندو لەزابتەکانو منەوەرەکان نزیك ئەکەوتەوە. بەلام وەکو ووتوبومان، نەترسان لەدواڕۆژو ئازاییو کەم تەرخەمی لەلایەکەوە، (گرێیەکی نەفسی) کە بەرامبەر بەزابیتو منەوەر پەیای کردبوو لەلایەکی ترەوە بەرهەڵستی ئەوەبوو کە شەقێك لەدیواری خەنجەرو دەمانچەکە هەڵداو بیروخێنێو خۆی بگەیەنێتە خوێنەوارە باشەکان. لەناو منەوەرەکانو زابتە کوردەکاندا، بەڕاستی کەسانی باشو نیشتمان پەروەر هەبوون کە هەموویان لەوانە نەبوون کە (شێخ مەحمود) لێیان بسڵەمێتەوە، بەلام وەکو ووتمان (گرێیەکی نەفسی) لەودیو دیواری

خەنجەرو دەمانچەکەوە (شێخ مەحموود)ی ڕاگرتبوو، وەستاندبووی. بەرهەڵستیی هەرەگرنگی نزیکبوونەوەی بوو لەگەڵ زابتەکاندا، ئەمەش گرێیەکی تازە نەبوو.

بەڵکوو ئەو ڕۆژە پەیا بووبوو کە لقی کۆمەڵەی (اتحاد و ترقی) لەسلێمانی دامەزرابوو. ئەو کۆمەڵە، کەبەشی زۆری لەم چەشنە زابتانەبوو کە بووبوون بەهۆی دەرپەڕاندنی نەوەی (کاك ئەحمەد) لەسلێمانی. ئەو دەرپەڕینە کە بەکوژرانی (شێخ سعید)ی باوکی (شێخ مەحمود) دووایی هاتبوو، بووبوو بەهۆی نوشوستیو دەربەدەریو کەساسیو ماڵوێرانییان))[٦٢].

کێشەی بنەڕەتیی ئەفسەرە کوردەکان ئەوە بوو: ئەوان پەروەردەی دەستی دەزگای عەسکەریی دەوڵەتی عوسمانی بوون، نەك پەروەردەی دەستی دەوڵەتێکی کوردی. هەندێك لەم ئەفسەرانە تا دوا هەناسەی ئەم ئیمپراتۆرییەتە ساڵی ١٩٢٣ لەئەستەموول بەدیار کەلاوەی داڕوخاوی ماڵی (پیاوە نەخۆشەکەوە) مانەوە. نەیان دەتوانی ماڵئاوایی لەو خەونە بکەن، کە ژیانی خۆیان بۆ خزمەتکردن لەڕیزی سوپای ئەم دەوڵەتەدا بەسەر بردبوو، ڕەنگە ڕووخانی ئەم ڕژێمەیان بەئەفسانە دانابێ. ئیدی تا دڵنیا نەبوون لەوەی (مانگا مردو دۆ بڕا)و ئەو قەلایەی پاڵیان پێوە دابوو، ڕووخاو دەبێ پاڵ بەقەلایەکی ترەوە بدەن، ئەوان نەگەڕانەوە. بەشێکیان کاتێك گەڕایەوە، کە بەریتانیاو دەوڵەتی عیراق بەڵێنی کارو موچەو ڕێزلێ گرتنی پێدابوون، ئینجا توانیان ڕێگەی (بەغدا) بگرنە بەر، لەئەستەمبووڵەوە بۆ بەغدا.

لەوە دەچێ دامەزراوەی سیاسیی بزوتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد، ئەوەندە توانای ڕاکێشانی نەبوبێت، چاوەڕوانیی ئەفسەرو ڕووناکبیران تێربکاتو داواکانیان جێ بەجێ بکات. یەکێك فێری ژیانو ئاوو هەوای شارێکی وەکو ئەستەمووڵ بووبێت، ئاستەمە بۆ وڵاتێکی وێرانو برسیو کاول بگەڕێتەوە.

ئەم نەوەیە لەڕووناکبیران، بەبیری ڕۆژئاواییو مۆدێرنو زانست پەروەردە کرابوون، ئەمانە بەهۆی دووری لەنیشتمانو پەروەردەی نوێو گیانی ڕۆژاواییەوە، هەر بەتەواوی لەگەڵ ژیانو نەریتی کوردەواری نامۆ بوون. بەشێك لەمانە ببوونە خاوەن شێوازێکی جیاواز لەئاخاوتندا (زۆر بەکارهێنانی وشەی تورکیو عەرەبیو ڕۆژئاوایی - میقرۆب - دقتۆر - ئۆتۆمبێل... هتد) لەجلو بەرگیشدا، لەگەڵ ڕەشو ڕووتی ئەو وڵاتەدا، هەر زۆر جیاواز بوون (قاتو بۆینباخو تەربوشو سمێڵ قیتکردن... هتد) لەهەڵسوکەوتو جوڵانەوەو ڕێکردنو چۆنیو چاکیو هەواڵ پرسیندا، خۆیان لەو خەڵکە کردبووە (خەمیس افندی)ەکەی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی):

**دەتووت تەمێ کرابوو بەمەخصوصی قاپییەوان**
**خۆی کرد بەنێرە تورك ووتی (کیم بلیری سزی)؟**

**پێم ووت: منم کەسەکەم مامە شێخ ڕەزا**
**(تانمزمیسن، خومیس ئەفەندی، مەگەبزی)؟[٦٤]**

گرنگ نییە داستانەکەی (شێخ ڕەزا)و[٦٥] (شێخ محەمەد عەلی)و برازاکەی ڕاست بێت یان ناڕاست. دیاردەی نامۆ بوون ENTFREMDUNG کە بەرجەستە کراوە، شەپۆلی پەپوولەی سەرنج بۆخۆی ڕادەکێشێ، ئەم ڕووناکبیرانە لەناو کۆمەڵدا (وەکو گای قەشە) لەبەرچاو بوون. ئەمانە لەناو جیهانی ئەندێشەو خەوندا دەژیان، بەکردەوەو قسەو جلو بەرگ، لەدۆڵێکدابوون، بەشەکانی تری بۆرجوازیش لەدۆڵێکی تر. ئەمانە نەیان دەتوانی دیواری نێوان خۆیانو خەڵکی بڕوخێننو تێکەڵاویان بن. نەیان دەتوانی بەرژەوەندیی ناوکۆیی

لەگەڵ بازرگانو کاسبکاراندا بدۆزنەوەو ئەمان ببنە دەمڕاستی ئەوان. بەگشتی ئەمانە، لەڕووی تێگەیشتنو نزیکییەوە لەهێزی داگیرکەری بەریتانیاوە نزیکتر بوونو دەیانتوانی هاریکاری بکەن تا بەشەکانی تری چینەکەی خۆیان. کاتێك سلێمانی لەلایەن هێزی ئاسمانی بەریتانیاوە بۆمباباران کراو هێزەکانی (شێخ مەحمود) ناچاری شار چۆڵکردن کران، ڕووناکبیران، نەیانتوانی هیچ دەستپێشکەرییەك بکەن. ئەوان گەر بڕوایان بەڕزگاریو سەربەخۆی بوو، بەبێ بەکارهێنانی زەبرو زەنگ یان خەباتی چەکداری دەبا هەوڵدەن، بەڕێگە ئاشتییانە گوشار بخەنە سەر بەڕێوەبەرایەتی داگیرکەر، دان بەمافەکانی گەلی کورددا بنێن، یان هیچ نەبێ بەشێك لەداواکارییەکان جێبەجێ بکات. لەوە دەچێ وەچەیەك لەڕووناکبیران کەوتبنە بن کارتێکردنی بیروڕای مێژونووس (ئەمین زەکی بەگ). ئەو ئامۆژگاری لاوانی بەوە کردووە کە سیاسەت کارێکی بێ هودەیەو باشتر وایە، بیرو هۆشی خۆیان بدەنە فێربوونو زانست.

## نەوەی بنەماڵەی ئۆرۆستۆكراتی

هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی، تەنیا ڕوداوێكی سیاسیی ـ سەربازیی ڕووت نەبوو. دەوڵەتێكی مەزن لەسەر نەخشەی سیاسیی جیهان سڕایەوەو لەجێگەی ئەودا كۆمەڵە دەوڵەتێك لەسەر خاكەكەیدا قووت كرانەوە، كە خۆیان بەدەوڵەتی (ناسیۆنالستی) دادەنا. ژمارەیەك دامەزراوەی ئابووریو كۆمەڵایەتیو فەرهەنگیی كۆن داڕووخانو كۆمەڵێكی تر هاتە پێشەوە. ئەم گۆڕانكارییە ناوچەی سلێمانیشی گرتەوە، دەسەڵاتی میرانی بابان لەخۆ خواركردنەوەو پوچەڵ بوونەوە بوو. ئەوان لەناوەڕاستی سەدەی ١٩ دەسەڵاتی سیاسیی ـ سەربازییان دۆڕاند، دەسەڵاتی ئابووریو كۆمەڵایەتیو فەرهەنگیشیان بەرەبەرە بۆ دەست بنەماڵەی شێخان جێگۆڕكێی كرد.

نەوەی میرانی بابان، پاش نزیكەی ٧٠ ساڵ لەهەرەسی میرنشینەكەیاندا، ئەوەندەشیان لەتوانادا نەبوو داواكاری سیاسیی، گەڕانەوەی میرایەتی بخەنە ڕوو. ئەوان، هەموو داوو دەزگاو دامەزراوی سەردەمی بابانیان لەدەست چووبوو. لەناو كۆمەڵانی خەڵكیشدا، هیچ بنكەو بنەمایەكیان نەمابووەوە، لەڕووی ئابووریشەوە ئەو ژمارە كەمەی كەسایەتی سەر بەو بنەماڵەیە هیچ كێشو قورساییەكی ئەوتۆیان لەچاو گروپەكانی تردا نەمابووەوە. گەر موڵكو زەویو زاری كەسایەتییەكانی سەر بەم بنەماڵەیە بۆ نمونە (عەزمی بەگی بابان) لەگەڵ یەكێكی بنەماڵەی شێخاندا بەراورد پێ بكرێن، تای تەرازووی لایەنی دووەم بەرەو ئاسمان هەڵدەكشێ. بێگومان دەیانتوانی جوڵانەوەیەكی سیاسیی پێك بهێننو خەڵك بۆ (پرۆژەیەك) خڕ بكەنەوە، بەڵام كەسیان مۆتیڤو ئارەزووی ئەوەی نەبوو، بۆ (شانازی ناوو سەروەری مێژوویی باو و باپیران) كارێك بكاتو ڕێگەی ماندوو بوون بگرێتە بەر. ئەمان پێیان باش بوو، چارەنووسی خۆیان لەگەڵ چارەنووسی دەوڵەتێكدا گرێ بدەنو هەوڵ بدەن، بەپەیژەی كارو پلەی

حوکومەتیدا سەربکەون. ئەمانە بەگشتی لەکەلەپووری میرایەتی باوو باپیران‌و زمانی دایك ئەوەندە دوور کەوتبونەوە، بۆئەوەی لەکوردێك تێ بگەن یان بەتورکی‌و عەرەبی قسە بکەن یان پەنایان بۆ وەرگێڕ دەبرد، بۆئەوەی لەکورد تێبگەن، (بۆ نمونە حەمدی بەگی بابان، کە ئینگلیزەکان دەیانویست ئەرکێکی سیاسیی گەورەی پێبسپێرن، پاشان پاشگەزبوونەوە).

ئێمە ئەگەر سەیری مێژووی ئەم سەردەمە بکەین، بەتایبەت سەرچاوە ئینگلیزییەکان، بەرامبەر ناوی بابانەکان لە دوو کەوانەدا نوسراوە (بەعەرەب یان بەتورك بووە). ئەمانە هەر بەراستیش وا بوون: نکوڵی مافی کوردیان دەکردو لەریزی ئەواندا نەبوون، لەسەر داواکردنی مافی کورد سوور نەبوون، چونکە بەرژەوەندییان لەگەڵ بەرژەوەندی داگیرکەراندا گرێدابوو. هەر بۆ نموونە یەکێکی وەك (ئیسماعیل حەقی بابان) (١٨٧٦ ـ ١٩١٤)، کە قانونی‌و ڕۆژنامەنووس بووەو بەیەکێك لەسەرکردەکانی (اتحاد و ترقی) دادەنرێت، ساڵی ١٩٠٨ پۆستی وەزیری (مەعاریف)ی[٦٦] لەدەوڵەتی عوسمانیدا پێسپێردرا. ئەو لایەنگری ئەوە بووە کە دەوڵەتی عوسمانی وەکو دەوڵەتێکی دەستوری بمێنێتەوەو ڕێگەش نەدرێ بزوتنەوە ناسیونالستییەکان سەر بەرز بکەنەوە، ئەو بەروونی لە (ڕۆژی کورد)دا بیروڕای خۆی نووسیووە: ((واتە بۆ یەکێتی ئیسلام‌و سەرکەوتنی دەبێ دەستورێکمان هەبێ، ئەو دەستوورەش بەرایی موسوڵمانەتی، دواتر عەرەب، تورك، کورد، یا عەجەم))ە. لەکۆتایی وتارەکەیدا دەنووسێت: ((لەبەرئەوە بۆ کورد وەکو لەهەموو نەتەوە ئیسلامەکاندا هەیە پرۆگرام بەم جۆرەیە: (یەکەم ئیسلام، دوایی کورد، بەمە دەبێ ئیسلامەتی خزمەتی کوردایەتی بکاو هەستی بیری دینداری لەناو کوردا بەهێز دەبێ‌و خزمەتی ئیسلامییەتی‌و کوردایەتی بکا[٦٧]))

لەنێوان سالآنی ١٩٢١ ـ ١٩٥٨دا واتە لەسەردەمی مەلەکی لەعیراقدا، ژمارەیەك لەبنەماڵەی بابان پلەو پایەی حکومەتیی گرنگیان پێدراو تەنانەت بوونە وەزیرو سەرۆك وەزیرانیش. (ئەحمەد موختار بابان) (١٩٠٠ـ ١٩٧٦)، کە دوا سەرۆك وەزیرانی سەردەمی مەلەکی بوو لەعیراقدا، ئەمیش یەکێك بووە لەوانەی گەر سەرچاوەیەك بەئینگلیزی لەسەری نووسیبێت، بەتەنیشت ناوەکەیەوە نوسراوە (Arabized Kurd). ئەمڕۆ بابانەکان نەوەکو تاكو نەوەکو گروپ، بەڵکو لەڕووی سیاسییەوە، دەورێکی ئەوتۆیان نییەو وەکو هاوڵاتییەك ژیانی ئاسایی خۆیان بەسەر دەبەنو هیچ شوێنەواری (دەسەڵاتو دەوڵەمەندی) لەئاسۆی کۆمەڵایەتی ئەواندا بەدی ناکرێ، ئەوانە نەبێت، بەمێشكو بازووی خۆیان پلەی ئابووریو ئیداریی باشیان وەدەستهێنابێت.

گروپە کۆمەڵایەتییەکانی تر، کەجاران هاوپەیمانی میران بوونو بەبەشێك لەچینی ئەرۆستۆکراتی میرنشین دادەنران وەکو: بنەماڵەی مەسرەف (مصرف)و بنەماڵەی ساحێبقڕان (صاحبقڕان). ئەمانە لەوە دەچێ وەکو بابانەکان (میران) توشی گرتنو گواستنەوەو دورخستنەوە نەبووبن. پاش یەکەمین جەنگی جیهانیش نەخرانە پەراوێزی ڕووداوەکانەوە. ناویان لەچالاکی سیاسیی ـ نەتەوەیی ـ ڕزگاریدا دیارەو تاڕادەیەك لەناوەندی بزافەکەوە زۆر دوور نەبوون، هەروەکو لەلاپەڕەکانی پێشوتردا باس کرا. لەبنەماڵەی مەسرەف (حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا) (١٨٨٧ ـ ١٩٦٢)[٦٨] کە یەکێك لەکەسایەتییە ناسراوەکانی شار بوو. لەحکومەتی (شێخ مەحمود)دا پۆستی وەزیری وەرگرت، بەڵام لەحکومەتی عیراقدا هیچ پۆستێکی ڕەسمیی نەبوو. لەبنەماڵەی ساحێبقڕاندا، (حەمدی شاعیر) (١٨٧٦ ـ ١٩٣٦)[٦٩] پۆستی وەزیری گومرگو کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی بوو. هەڵوێستی (حەمدی) لەحکومەتی (شێخ مەحمود)دا دوو لایەنی هەیە، جارێکیان هی ئەوکاتەیە کە شێخ لەتاراوگە بووە، پاش گەڕانەوەی (شێخ

مەحموود) لەدەرەوەی ولاَت هەڵوێستێکی ڕەخنە گرانەی توندی هەبووە: (باسی تەشکیلاتی ثانی هەر ئەکەم هەر بۆ پێکەنین)، کە لەهەمان بنەماڵەدا (سالّح زەکی ساحێبقڕان)یش پۆستی وەزیری بەرگری وەرگرت. لقێکی بنەماڵەی قەواس، کە بەبنەماڵەی تابوور ئاغاسی (طابورآغاسی) ناسراون، کەئەمانەش لەگەڵ بنەماڵەی میرەکانی باباندا هاوپەیمان بوون. ئەمانە، پاش ڕوخاندنی میرنشینی بابان ڕەوانەی تاراوگە کران. ئەمانە، لەگەڵ (شێخ مەحمودی حەفید)دا نێوانیان زۆر باش نەبووە. (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی تابوور ئاغاسی)، لەنێوان (١٩٢٥ ـ ١٩٣٠) موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی بوو. (ئەحمەد بەگ) دەیویست هەوڵی بوژاندنەوەی سامانی ڕووناکبیریی گەلی کورد بدات، ئەم هەوڵو تەقەلایەی ئەو، لەگەڵ بۆچونی بەشی دەوڵەمەندی بۆرجوازیی کورد دەگونجا، کەپێیان باش بوو، کورد لەپەنابردنەبەرو بەکارهێنانی زەبرو زەنگ خۆی دوور بخاتەوە. تەنیا لە ڕێگەی پەرەپێدانی خوێندەواریو زیندووکردنەوەی ئەدەبو زمانو مێژووی کوردەوە، دەتوانرێ (نەتەوەی کورد) بەرەو پێشەوە ببرێت. ئەم هەوڵو تەقەلایە، ئەگەرچی خێرا بەرهەمی بەدەستەوە نەداوە، بەلاَم کاری خۆی کردووەتە سەر گەشەکردنی بزوتنەوەی سیاسییو ڕووناکبیری لەسالاَنی پاشتردا.

## مستەفا پاشای یامولکی

سلێمانی (١٨٦٨ ـ ١٩٣٦)، پلەی (میرلوا) لەسوپای عوسمانیدا، سەرۆکی جەمعیەتی کوردستان ١٩٢٢، ڕەئیسی مەعاریف (وەزیری مەعاریف) لەحکومەتی (شێخ مەحموودی حەفید)دا ١٩٢٢، خاوەن ئیمتیازو بەرپرسیارو سەرنووسەری ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) بووە.

مستەفا پاشا، بەوەچەی یەکەمی بیری نەتەوەیی کورد دادەنرێت. ئەم وەچەیە بەشێوەیەکی گشتی بڕوای بە ڕزگارکردنی کوردستان بوو، بەیارمەتی هێزێکی دەرەکی (ئینگلیز)و پشتبەستن بەهێزی عەشایریو خەڵکی ناودارو خاوەن دەسەڵاتی کۆمەڵو بایەخ نەدان بەخستنەگەڕی هێزو توانای جەماوەر لەڕووی ڕێکخستنەوە. هەرچەند ئەو دەستپێشکەریی کردووە بۆ دامەزراندنی کومەڵەیەك، بەڵام ئەم ڕێکخستنە، کاتیو لاوازو کز بووەو هیچ دینامیکییەکی بۆ کۆکردنەوەی خەڵك نەبووە.

مستەفا پاشا، بڕوای بەپان ئیسلامیزم هەبووە کە لەسێبەریا گەلی کورد بەمافی ڕەوای خۆی بگات (ب. ك. ژ. ١٢)، ئەمەش هۆیەکی گرنگ بووە بۆ دوژمنایەتی کردنی (جەمعیەتی اتحاد وترقی)و پاشان جوڵانەوەکەی کەمال ئەتاتورك (ب. ك. ژ. ١٠). ئەو هەر لەبەر ئەم هۆیەش بووە کە لەناو حکومەتەکەی (شێخ مەحمود)دا بووەتە دەمڕاستی باڵی لایەنگرانی ئینگلیزو هەوڵی تێکشکانی باڵی لایەنگرانی تورکی داوە (جل خوارەکان)، بەبێ ئەوەی لەدەوری کۆڵۆنیالیستیی ئینگلیز تێبگات. ئینگلیز، (چاوی لەتەقو تۆقی گوێزی هەورامان نییەو یاحەسرەتکێشی دووکەڵی تونی بابان بێت) (ب. ك. ژ. ١٤) (هەموو کەس سیاسەت نازانێت، ئاە ئەگەر بەئینسافی گوێیان لەمن بگرتایە! محەبەت بریتانیامان لەدەست بەرنەدایە!!) (ب. ك. ژ. ١٤) (هەر حکوومەت فەخیمەی بریتانیایە،وقوم ئازاد ئینگلیز کە ئازادی خۆ کرد کردنەوەی کوردانی

لاپێویست بێت‌و هەر ئەوە معاوەنەت کوردستانی پێ بکرێ‌و لەظرف دو ۳ سەعاتدا بەئیمدادی مەزلۆمانی کوردانا بگا) (ب. ك. ژ.١٤)، گوایا بەریتانیای گەورە، حەزی لەدراوسێیەتی‌و خێرخواهییەو بەرژەوەندی ئینگلیز لەهندستانە، نەك لەکوردستان.

مستەفا پاشا، لەگەڵ نوێنەرانی تری وەچەی یەکەمی بیری نەتەوەیی کە میرو شێخ‌و ئەفسەری گەورە ـ لەوڵاتانی تردا مەلیك شازادەکان ئاڵا هەڵگری بوون، تەنیا ئاوێزانی بیری یەکگرتنەوەی نەتەوەیی‌و پشت گوێ خستنی سەربەستی‌و ئازادی‌و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بوون. ئەو بەچاوێکی ڕەخنە گرانەوە سەیری کۆمەڵی کردووەو ناڕەزایی خۆی لەپەیوەندییە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەدا دەربڕیوە. ڕەخنە گرتن لەدواکەوتنی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و گیانی پارچە پارچەیی‌و تەسك بینی‌و هەست نەکردن بەپێویستی پێشکەوتن بۆ ئاستی گەلانی تر. لەم ڕووەوە ئەو درێژەی بەڕەوتی بیرکردنەوەی (حاجی قادری کۆیی)و تێڕوانینی سیاسیی ڕۆژنامەی (کوردستان) داوە. (ڕەفیق حیلمی) ئاماژەی بۆ دوو خاڵی گرنگ کردووە سەبارەت بەکەسایەتی‌و هەڵوێستی (مستەفا پاشا)، کە بەووردی‌و ڕوونی سروشتی ڕووناکبیری ناسیۆنالیستی کورد لەم سەردەمەداو شێوەی بیرکردنەوەو هەڵکەوتنیان لەکۆمەڵدا دەردەخات:

یەکەم: (مستەفا پاشا)ی ڕەئیسی جەمعیەتی کوردستان بەتەرکەن خۆی لەجەمعیەت نە ئەگەیاند. ئەویش بەچەشنی کوێخاو ئاغاکان شوێن (شێخ قادری حەفید) کەوتبوو، لەگەڵ ئەودا خەریك بوو (ل ٥١٠).

دووەم: لای کوردە خوێنگەرمەکان‌و نیشتمان پەروەرەکان، ئەوەندە جێی متمانە نەبوو. جلخوارەکان بەپیاوی ئینگلیزیان دەزانی‌و زۆریان ئەبوغزاند. لەمانە، جێی داخە زمان ناڕەحەتیی خۆی بوو. لەو ڕۆژەوە کە گەڕایەوە سلێمانی ناوو شورەتێ کە لەدەرەوە هەیبوو ڕووی کردە کزی. شێخ‌و مەلاو توجارو

کاسب‌و خوێنده‌وار هه‌موو ده‌سته‌و پۆله‌کانی شاری سلێمانی هه‌ریه‌که‌ی به‌جۆرێ له‌خۆی زیز کردبوو یان تۆراندبوو. واته ڕه‌وشێکی وای نه‌گرتبوو که خه‌ڵکی سلێمانی بباته پێشه‌وه.

هه‌رچه‌ند (میر لوا) (یه‌کی ئه‌رکانی حه‌رب) بوو، به‌ڵام خۆی وا نه‌ئه‌نوان خاوه‌نی زانستێکی (ثقافة) به‌رز بێ‌و به‌ته‌نگ (لاسایی)یه‌کانی کۆمه‌ڵایه‌تییه‌وه نه‌بوو (ل. ٤٩١ ـ ٤٩٢).

جیهانیَ نامۆیی‌و واقیع هێنده‌ی لای ئه‌و له‌یه‌که‌وه دوور بوون، که نه‌یتوانیوه ئامرازێك دروست کات بۆ به‌دیهێنانی ئه‌و ئامانجانه‌ی خۆی که له‌به‌رچاوی گرتوون. په‌یوه‌ندی کۆمه‌ڵایه‌تیشی له‌ئاستێکی زۆر جیاوازدا بوو له‌چاو په‌یوه‌ندی کۆمه‌ڵایه‌تی ژیانی ڕۆشنبیریی ئه‌سته‌مبووڵ له‌و کاته‌دا، داوودەزگای سیاسیی‌و کۆمه‌ڵایه‌تیش له‌بارێکی تردا بووه‌و بۆیه به‌و شێوه‌یه وه‌ته‌ق که‌وتووه‌و ته‌نگی پێ هه‌ڵچنراوه.

تەنیا بەشێکی ئەو سەرچاوانەم دەستنیشان کردووە، کە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر مستەفا پاشا پێویست بوون:

## سەرچاوەکان:

١ ـ ژمارەکانی بانگی کوردستان، (کۆکردنەوەو لەسەرنووسین) جەمال خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٤. ٢ ـ ڕەفیق حلمی: یاداشت بەشی دووەم ، چ ٢٠، هەولێر ١٩٨٨. ل. ٤٨٦ ـ ٦٣٧. ٣ ـ هەندێ لەمەتروکەکانی حاجی مستەفا پاشا، ١٩٥٦، بەغداد، دار المعرفة. ٤ ـ د.کمال مظهر احمد: وەزیر معاریف حکومە الشیخ محمود. مؤسس (جمعیە کردستان )و صحیفە (بانکی کردستان)، (التآخي) ٢٨ کانون الثانی، ١٩٧٤. ٥ ـ ابراهیم باجلان: مصطفی پاشا یامولکی. صحفیاو سیاسیا، جریدە العراق، ع ٢٤١٣، (٩ کانون الثانی ١٩٨٤). ٦ ـ هاوار: حاجی مستەفا پاشای یامولکیو سمایل خانی شکاك (سمکۆ)، مامۆستای کورد، ژمارە (٩٩، ٨٩، ٨).

## تێبینی:

جێگەی داخە، کەمن تەنیا بەشێکی زۆر کەمی ئەم سەرچاوانەم بەردەست کەوتووەو هەلم نەبووە زانیاری وورد تری لەسەر بنووسم.

## محەمەد ئەمین زەکی

(١٨٨٠ ـ ١٩٤٨) ڕوشدیەی عەسکەری ـ سلێمانی/ ئامادەیی سەربازی ـ بەغداد/ قوتابخانەی حەربیەی ـ ئەستەمبووڵ/ دوا پلەی لەسوپای عوسمانیدا (معاونی رئیس ئەرکان حرب) بووە. تا ڕۆژی ١٩٢٤/٧/٢٤ لەشاری ئەستەمبووڵ ماوەتەوەو هەر لەوێوە بۆ بەغداد گەڕاوەتەوە، هەمان پلەی عەسکەری لەسوپای بەغدادا وەرگرتووە، لەسەرەتادا بووە بەفەرماندەی فێرگەی عەسکەری (آمر المدرسة العسكرية). بەشداری لەڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کردووەو ژمارەیەك کتێبی لەسەر مێژووی ئەو ڕووداوانە نووسیوە، لەپەرلەمانی عیراقدا نوێنەری شاری سلێمانی بووەو ماوەیەك جێگری سەرۆکی پەرلەمان بووە، لەساڵی ١٩٢٥ تا ساڵی ١٩٤٢ یازدە جار پۆستی وەزارەتی وەرگرتووە، وەکو وەزارەتی بەرگریو وەزارەتی مەعاریف... هتد.

(محمد امین زەکی بەگ) کوڕی (حاجی عبدالرحمان محموود)ە، حاجی ئەو ڕەحمان، بازرگانی تووتن بووەو بارو دۆخی ژیانی دارایی باش بووە.

(ئەمین زەکی بەگ) لەدووڕووەوە لەمێژووی کورددا دەورێکی بنەڕەتی بینیوە: ئەگەر شەرەفخانی بەدلیسی (١٥٤٣ ـ ١٦٠٤) بەباوکی مێژووی کورد دانرێت، ئەوە مامۆستا (ئەمین زەکی) باوکی مێژووی نوێیە، ئەم ڕێچکەی نووسینی مێژووی شکاندووەو بەکوردی مێژووی نوێی کوردو کوردستانی نووسیوە، ئەمیش وەکو (شەرەفخانی بەدلیسی) لەگۆشەنیگای کوردبوونەوە مێژووی خوێندووەتەوەو مێژووی خۆی تۆمار کردووە، بەنووسینەکانی گیانی خۆ بەکورد زانینی بوژاندووەتەوە، لەناو جیهانێکدا شەپۆلی تەپو تۆزی ((عوسمانی بوون))و ((تۆرانیچێتی))و ((یەکێتی ئیسلامی))و عەرەبی (عروبە) مێشکی ڕووناکبیرانی داپۆشیبوو.

ئەم گیانی کورد بوونی بوژاندووەتەوەو چالاکانەو زانستیانە کوردی پێناسە کردووەو ناسنامەی بەهۆشیاریو بەئاگاهاتنەوەی سیاسییەوە گرێداوە، ئەو بەشێوەیەکی مۆدێرن مێژووی کوردی نووسیوەتەوەو پشتی بەسەرچاوەی ڕۆژاواییو ڕۆژهەلاتی بەستووەو سەرچاوەی (خۆماڵی) پشتگوێ خستووە بۆ نموونە: بەڵگەنامەو دەسنووسو لێکۆڵینەوەی مەیدانیو ئەژمارو گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانەی خۆیان لەڕووداوەکاندا ژیاون، سوودی وەرنەگرتووە. ئەم لەگەڵ شەرەفنامەدا پردی بەردەوامبوونی دروست کردووەو ناسنامەی کوردی بۆ ئاست ناسنامەی گەلانی تری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەرز کردووەتەوە. کڵپەی ئەو ئاگری هۆشیاربوونەوەیەی ئەو دایگیرساند، تا ڕۆژی ئەمڕۆ هەر بەردەوامە.

زانای مەزن (ئەمین زەکی) پیاوێکی سیاسیی گەورەی کورد بووە، بەلام لەئاگری جوولانەوەی سیاسیی چەکدارەوە دوور بووەو بەهیچ شێوەیەك بەشداری تێدا نەکردووە، لەبیستەکانو سییەکانی سەدەی ڕابووردوودا کێشو قورساییو کاریگەرێتی، ڕێکخراوەییو حیزبی هێندە ڕەسیوو پێشکەوتوو نەبووە کە ئەم خۆی لێیان نزیك بکاتەوە، یان ئەوان هەوڵی نزیك بوونەوە بدەنو سوود لەئەزموونی زانستیو سیاسیی ئەو وەربگرن.

ئەو دیارە لەو بابەتە سیاسییانە بووە، کە بەحوکمی کاری عەسکەریو تێکەلاوبوونی داوو دەزگای سەربازی لەگەڵ کاری دەوڵەتیدا ئاشنایەتی پەیدا کردووەو ڕاهاتووە. ئەو لەماوەیەکی زۆر کەمدا، لەسۆنگەی بەهرەو زانیاریو پلەی سەربازیی خۆیەوە، توانیی لەناو هەیکەلی دامەزراوەکانی دەوڵەتی عیراقدا جێگەی خۆی بکاتەوە، بەلام ئەو لەو بابەتانە نەبووە کە بەرژەوەندی خۆی لە سەرووی بەرژەوەندیی گەلەکە دانێ، بەپێچەوانەوە، هۆڵی پەرلەمانی کردووەتە هۆڵی دادگاییکردنو داکۆکی لەمافە ڕەواکانی گەلی کوردو تاوانبار کردنی ڕێبازی

سیاسیی‌و جیاوازی فەرهەنگی‌و پەروەردەیی‌و زیانی بۆ داهاتووی عیراق، بەڕوونی خستووەتە بەرچاو.

ئەو بەهۆی شارەزایی لەزمانی تورکی‌و ئینگلیزی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و کوردی‌و جێگای زۆر نزیکی لەناوەندی دەسەڵاتەوە، لەسەر چاوەکانی زانیاری‌و دەنگوباس (Information)ەوە نزیك بووە. ئەو بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەی کورد (پشتی بەتوصیاتی عصبە الامم)و بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیران‌و ڕێکەوتننامەکانی عیراق‌و بەریتانیا بەستووە. نامەی هۆشیارکردنەوە بۆ سەرۆك وەزیران‌و مەلیك فەیسەڵی یەکەم‌و موعتەمەدی سامی بەریتانی نووسیوە.

(ئەمین زەکی بەگ) بەفاکت‌و ژمارەو ئامار (ستاتیستیك: أحصاء) سەلماندویەتی ڕێبازی سیاسیی‌و کورتبین تەسکبینی تایفەگەری، زیان بەبەرژەوەندییەکانی گەلی کورد دەگەیەنێ‌و بۆ داهاتووی دەوڵەتی عیراقیش کێشەی زۆر قورس پەیدا دەکات. لەم ڕووەوە ڕەنگە مێژوونوسی گەورە، یەکەمین کەس بێت کاربەدەستانی بۆ ناڕاستیی سیاسەتی بەعەرەبکردن (تعریب) هۆشیارکردبێتەوە. یەکەمین کەسیشە بەزمانی یاسایی ماف گەلان، ماف ڕەوای گەلی کوردی بەرچاو خستبێت.

## گرنگترین بەرهەمەکانی ئەمین زەکی :

- خولاسەیەکی تأریخی کوردو کوردستان ج١، ج٢، بەغدا، (١٩٣١و ١٩٣٧).
- تأریخی سلێمانی ولاّتی ١٩٣٩.
- دوو تەقەلای بێ سوود، بەغدا ١٩٣٥.

بریا سەرجەم نامەو ڕاپۆرتو گوتارەکانی کۆکرێتەوەو هەر هەمووی پێکەوە چاپ بکرێتەوە، چونکە ئاوێنەی قۆناغێکنو بۆ ئەمڕۆی خەباتی گەلی کورد سوودیان هەیە. (ئێستا بنکەی ژین) قۆڵی لێهەڵماڵیوەو سەرجەمی بەرهەمەکانی (ئەمین زەکی بەگ) لەچەند بەرگێکدا بلاّو دەکاتەوە.

## جەمال عیرفان

شاری سلێمانی (١٨٨١ ـ ١٩٢٢/١٢/١٢) ڕوشدییەی عەسکەری، ئەفسەر، پلەی ئەرکان حەرب لەسوپای عوسمانیدا، ساڵی ١٩١٩ فەرماندەی هێزی سوارە بووە/ مودیر ناحیەی مەرگە/ ئەندامی مەجلیس ئیدارەی سلێمانی ١٩٢١/ ڕێکخراوی سیاسیی دروست کردووە بۆ ئەوەی گوشاری سیاسیی بۆ سەر دەسەڵاتدارانی بەریتانی بەهێز بکرێتو ناچار بکرێن (شێخ محموودی حەفید) لەتاراوگە ئازاد بکەن. پێش یەکەم جەنگی جیهانی، دووساڵ لەئەڵەمانیادا دەورەی سەربازی بینیوە، وەکو نوێنەری کورد، بەشداری لەکۆنگرەی گەلانی ڕۆژهەڵاتیدا کردووە، کە لەلایەن لێنینەوە سەرپەرشتی کراوە.

جەمال عیرفان، کوڕی مەلا عەبدوڵڵا عیرفانە (ساڵی مردن: ١٩١٤). باوکی پیاوێکی خوێندەوارو ڕووناکبیر بووە، لەماڵەوە دەزگای (اسطرلاب)ی بۆ کاروباری فەلەکناسی دروست کردووە. هێزە ئایینییە چەکدارەکان چەندین جار چوونەتە سەریو ویستوویانە بیکوژن. لەقوتابخانەی ڕوشدیە مامۆستا بووەو پاش خۆی شیعرو نووسینی بۆ بەجێ هێشتووین/ سێ کوڕو چوار کچ/ کوڕەکان: ئەحمەد کەمالو جەمال عیرفانو عەلی عیرفانو کچەکانی حەپسەو کامیلەو نائیلەو حەبیبە. کچو کوڕەکان هەموو خوێندەواری باش بوون. جەمال عیرفانیش کوڕو کچێکی لەدوا بەجێ ماوە عادیلو جەمیلە. یەکەمین کەسە لەنێو کورددا لەسەر بیروباوەری سیاسی تێرۆرکرابێت. دووەمین کەسیش شاعیرو نوسەر عارف صائیبە (١٨٨٩ ـ ١٩٢٣) هەردووکیان خزمنو کاتی کوشتنەکەیان لەیەکەوە نزیکەو ڕەنگە هێزی تیرۆرکەریش هەر هەمان هێز بوو بێت.

ئەو سەردەمە بەریتانیاو تورکیا، لەسەر دابەشکردنی سنوری ناوچەی دەسەلات، لەبارودۆخی شەڕو پێکدادانو ململانێدا بوون. هەردوولا ویستویانە

دەسەڵاتی سەقامگیر نەبووی کورد، بکەنە مقاش و داردەست بۆ جێبەجێکردنی ئامانج و بەرژەوەندیی خۆیان.

جەمال عیرفان، لەگەڵ هەردوو بەرەکەدا نەبووەو بەربەرەکانێی کردوون. لەگەڵ هێزە کۆنەپەرستەکانیشدا دانووی نەکوڵاوەو ڕەنگە ئەمەش هۆیەك بێت، بۆئەوەی لەهەموو لایەکەوە بە (بۆلشەویك) ناوی ڕۆیشتبێت. هێزە تورك خوازەکان، لەکاتی ڕوودانی تیرۆرەکەدا، لەحکومەتەکەی شێخ مەحموددا ئەوپەڕی دەسەڵاتیان هەبووە و وپەلاماری ڕووناکبیرانیان داوە.

بەگوێرەی قسەی ڕەفیق حیلمی دەبێ هێزە ئایینییەکان کۆبونەوەیان کردبێت و فەتوای ئیعدام کردنیان دابێت و لایەنێکی سیاسی ـ چەکداریش ئامرازی جێبەجێکردنی فەراهەم کردبێ.

ڕەنگە (جەمال عیرفان) یەکەمین کوردبێت کە بەزمانی فاکت و ژمارە نووسیبێتی. وەکو بەڵگەی ڕاستیی بۆچوونێك، ئەو پێشنیاری کردووە کە پرۆژەی پیشەسازی دابمەزرێنرێت، بۆئەوەی شێوەی ئابووری بازرگانی بگۆڕێت، چونکە ئەم جۆرە ئابوورییە قازانجەکەی یەکجار کەمە، لەچاو پرۆژەی پیشەسازی مۆدێرندا. بۆ ڕوونکردنەوەی زیانی توتنەوان و بازرگانی کورد لە بازنەی بازرگانی کوردو بازرگانەکانی بەغدا، کە ڕەنگە تا ئەمڕۆش کاریگەرێتی هاوکێشەکە وەکو خۆی بێت:

سالانە لەشاری سلێمانیدا پانزە هەزار بار تووتن بەبەغدا فرۆشراوە. ئەم توتنە بایی (١,٠١٢,٥٠٠) ڕوپییە بووە، چونکە وەکو کەرەستەی خاو فرۆشراوە.

ئەو پێی وابووە ئەگەر تەنها (٥٠٠٠) بار تووتن بەبەغدا، پاش پرۆسەی پیشەسازیکردنی بفرۆشرێت، ئەوا (١٢,٠٠٠,٠٠٠) ڕوپییە دەکات. (دوانزە ملیۆن ڕوپییە). ئەو دەنووسێ: ئەگەر بەنرخی جگەرەی تورکی یان ئۆرپیشی نەفرۆشرێت، بەڵکو بە ٢٥٪ نرخی ئەوان بفرۆشرێت، هەر ئەو پێنج هەزار بارە

نزیکەی سێ ملیۆن روپییە دەکات، ئیدی لەم هاوکێشەیەدا ڕادەی زیانو هۆی تێکشانی ئابووریی کوردستان دەردەکەوێ.

لەبەشێکی تری نووسینەکەیدا، هانی خەڵك دەدات کە کۆمپانیای هاوبەش (شرکە مساهمە) دروست بکرێت.

پێش ئەو ڕەنگە بە دە ساڵیش کوردی تر پێشنیاری ئەم جۆرە کۆمپانیایەی بۆ دروست کردنی (ترامۆای) لەنێوان سلێمانیو کەرکووك کردووە، ئاواتی هەردوولا تا ڕۆژی ئەمڕۆ نەهاتووەتە دی.

پێشنیارێکی تر ئەوە بووە، جۆری کاڵا باشتر بکرێتو بازنەی بازاڕی فرۆش فراوانتر بکرێتەوە بۆ دەوڵەتانی تر، نەك تاکە یەك بازنەی داخراو!

(جەمال عیرفان) ڕووناکبیری نێو کۆشکی بەرزی بلووریِ نەبووە، بەڵکو بیرو باوەڕی بڵاوکردووەتەوەو تێکەڵاو خەڵك بووە، ڕێکخراوی سیاسیی نیشتمانی - چەپی دروست کردووە. بەشێك لەڕووناکبیران بە (مرشد) ناویان بردووەو وەکو ڕێبەرێك سەیریان کردووە.

(جەمال عیرفان) لەلایەکەوە بە (بۆلشەویك) ناوی ڕۆیشتووە، بەڵام لەنووسینەکەیدا پشتگیری لەپێشکەوتنی کەرتی بازرگانی ئازاد کردووەو پیشەسازی مۆدێرن لەنووسینەکانی ئەودا باسی لێوە کراوە. هەقە ئەو لەمەودوا وەکو پیشەساز نێو ببرێتو یاد بکرێتەوە، وەکو یەکێك لەباوکانی هەڵسانەوەی بازرگانیو پیشەسازی، ناوی کرێکارو جووتیارو خەباتی چینایەتی بەدی ناکرێ.

ساڵی ١٩٢١ مەندوبی سامی بریتانی لەبەغدا بڕیار دەدات (ئەنجومەنی تایبەتی بۆ پارێزگای سلێمانی) دامەزرێت. ئەنجومەنەکە بەم شێوەیە پێکهاتبوو لە (١٢) ئەندام: (٤) ئەندام نوێنەری شاری سلێمانی، (٤) ئەندام نوێنەری قەزاکانو (٤) فەرمانبەری حکومەت.

رۆژی ١٩٢١/١٠/١٦ لە پارێزگای سلێمانیدا هەڵبژاردن دەکرێت. هەڵبژاردنەکە سنووردار دەبێت، تەنیا ئەوانەی نرخی خانووەکەیان لە (١٠٠٠) هەزار روپیە زیاترە مافی دەنگدانیان هەبووە. بەگوێرەی تەقدیری شارەوانی ئەو کاتە (٢٠٥) کەس رێگەی دەنگدانیان پێدراوە. ئەم (٢٠٥) کەسە بەسندوقی دەنگدان لەکۆی (٣١) کاندید (٤) ئەندامیان هەڵبژاردووە، کە ئەمانەبوون: حاجی سەعید ئاغاو محەمەدی ئەورەحمان ئاغاو جەمال عیرفانو حاجی ئیبراهیم ئاغای خەفاف.

ئەم هەڵبژاردنە بەڵگەیە لەسەر رادەی رێزو گرنگی کەسایەتی جەمال عیرفان. ئەوانەی هەڵبژێردراونو ئەوانەی هەڵنەبژێردراون هەموو کەسایەتی دەوڵەمەندو بەدەسەڵاتو دەست رۆیشتووبوون.

لەوە دەچێ (مجلسی تایبەتی لیوای سلێمانی) تا ١٩٢٢/٩/٣٠ رۆژی گەڕانەوەی شێخ مەحموودی حەفید، کارابووبێت. تەنیا دوو مانگو دوانزە رۆژ پاش دروستبوونەوەی دەسەڵات بۆ جاری دووەم، جەمال عیرفان بەئاشکرا تیرۆر کراوە.

خوێندنەوەی وردی زانستی ژمارەکانی رۆژنامەی پێشکەوتن، کە دوا ژمارەی ١٩٢١/٧/٢٧ بڵاوبۆتەوە کەسایەتی جەمال عیرفان باشتر دەردەخات.

بڕوانە:- رۆڤار ـ دەزگای سەردەم ـ سلێمانی ـ تایبەت بەجەمال عیرفان.

ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨ ـ ١٩٣٢، سلێمانی، ٢٠٠٢.

ـ نامەیەکی بەڕێز فوئاد مەجید میسری.

ـ ژمارەکانی رۆژنامەی پێشکەوتن

ئەو هەلومەرجە ئابووری‌و سیاسیی‌و فەرهەنگییانەی کە بۆ چینە کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتانی ڕۆژئاواو هەندێ وڵاتانی ڕۆژهەڵات ڕێکەوتووە، بۆ چین‌وتوێژە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان ڕێك نەکەوتووە.

هەموو چینەکانی سەرەوەو بنەوەی کۆمەڵ، تووشی چەوسانەوەو پەلاماردان‌و راونـان‌و تـەنگ پـێ هەڵـچنین هـاتوون، یـەڵام هەریەکـەیان بەشـێوەیەك‌و هەریەکـەیان بـەگوێرەی شـوێن‌و جێگـەیان لەپرۆسـەی بەرهەمهێنانـدا. نـەبوونی ڕەشمـالّی دامـەزراوی دەوڵـەت، وەکـو هـۆی پارمەتیـدەر (کەتەلیزاتۆر ـ Katalysator) بۆ پەرەپێـدان‌و گەشـەپێدانی پـرۆژە ئـابووری‌و دارایـی‌و یاساییەکان. وەکـو پـارێزەرو پارمەتیـدەری دروسـتبوون‌و پەرەسـەندنی دەزگا ئابوورییەکان، نەبوونی ئەم کاتالیزاتۆرە، مۆرکی خۆی لەسەر ڕەوتی گەشە کردنی دامەزراوە ئابوورییەکان داناوە، داوو دەزگای دەوڵەتی ـ داگیرکەر، لەبواری بەرهەمهێناندا کۆسپ‌و ڕێگرو کۆنترا پـرۆدکتیف بـووە ــ واتـە ڕیـسی لـەئابووری داگیرکەر کردووە بەخوری ـ و هەمیشە وەکو ( شیری دامۆکلیس) بە ژوور سـەری گروپـە کۆمەڵایەتییەکانـەوە هەڵواسـراوەو بـەگوێرەی بەرژەوەنـدی دەوڵـەتی ناوەندی چین‌و توێژەکان پەرو باڵ کراون، گەر سەریانی نەپەڕێنرابێت.

ساڵی ١٨٢٠ لەنووسینەکانی (ریچ) دا تێبینی ئەوە دەکرێت پاشاو دەست‌و پەیوەندو جووتیارو بازرگان هەرهەموو پێکەوە، لەبن گووشاری نائارامی‌و نائاسایشی دەستدرێژی داگیرکەراندا، لەنێوان دوو بەرداشدا هەست بەپلیشانەوە دەکەن. ساڵی ١٩٢٠ هەر هەموو چینەکان بەدەست نائارامی‌و دواکەوتوویی‌و نادیاری چارە نووسەوە ناڵاندوویانە، وێڕای ئەم ڕاستییە گشتییە باری چینەکانی بنەوەی کۆمەڵ کە زۆربەی زۆری دانیشتوانیان پێکهێناوە، لەچاو چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵ هەر زۆر خراپتر بووە.

هێزە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵ، ئەوەندە بەتەنگ سازش‌و سازشکارییەوە هاتوون، لەگەڵ هێزی داگیر کەردا، بۆ زامنکردنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، نیو ئەوەندەش، لەخەمی کۆکردنەوەی هێزە جیاجیاکاندا نەبوون، بۆ هەنگاو نان بەرەو رزگاری‌و سەربەخۆیی. میکانیزمی سەپاندنی سیاسەتی داگیرکردن پێویستی بەوە بووە، توێژێك یان چینێك لەخۆی نزیك بکاتەوەو هەندێ دەسەلاتی - بەپەرو باڵکراوی - پێ ببەخشێ. ئاساییە دەسکەوت‌و قازانج‌و بەرژەوەندی گروپەکان دژی یەکتر بوون، داگیرکەر دژی هەر هەموویان بووە. ئەو تەنیا لەپەراوێزی میکانیزمی سەپاندنی دەسەلاتی خۆیدا، بواری نزیکبوونەوەو (پشی پشی) داوە بەهەندێ دەستەو توێژ، نەك بەشێوەی بەشداری‌و هاوبەشی‌و، هاوپشکایەتیی دەسەلات.

لەم نوسینە کورتەدا، پەیرەوی رێبازی کلاسیکیی گێرانەوەو نووسینی مێژوو نەکروە بەدوای تراویلکەی (چی؟) رووێداوەدا بگەرێین، ئەمە بوارێك بووە مێژوونوسانی کۆن تیایدا تاویان داوە، کۆمەڵناسی‌و دیرۆکی نوێ، بایەخ بە (چۆن؟)و (بۆ) رووداوێك رووێداوە دەدات‌و شەیدای گەرانە بەدوای داواکانی مۆتیڤ‌و هاندەرو پاڵێوەنەری گروپە کۆمەلایەتییەکان. شەپۆلی پرسیارە چاوکزاوەکان، لەسەرانسەری رووبەری بابەتدا دەوروژێنێت‌و لەناو تەپ‌و تۆزی ئایدۆلۆجیاو پروپاگەندەو دەنگوباسی دەسکرددا، سەرەداوەکانی راستی دەدۆزێتەوە. من بەهەر لایەکدا ویستبێتم جۆگەو بنەوانی لێکۆڵینەوە هەڵبەستم، تاشەبەردی نەبوونی زانیاری‌و دۆکۆمێنت‌و بەلگەو ژمارە، لەبەردەمما راست بوونەتەوەو ناچاری پێچ‌و دەورەیان کردووم.

جارێ پەنام بردووەتە بەر ماکرۆسۆسیۆلۆجی (Makrosoziologie)یان شیکردنەوەی درشت‌و سەرجەم، لەشوێنی تردا میکرۆسۆسیۆلۆجیم (Mikrosotiologie) لەبەرچاو گرتووە واتە: (یەکە)ی زۆر بچوکم رەچاو

کردووە، بۆئەوەی وێنەیەکی لە (واقیع) و (ڕاستی) نزیکەوە، پێشکەش بکرێت. جێگای خۆیەتی جارێکی تر بانگەوازی پێویستیی نووسین بکرێت، ئینسکلۆپیدیا بۆ ناودارانی کوردستان، تەرخان بکرێتو دەزگایەك سەرپەرشتی ئامادە کردنو پلانو دابەشکردنی بابەتەکانو کێشەی چاپو بلاوکردنەوە بکات، بەمەرجی دوور بوون لەگۆشەنیگای تەسکی حیزبو حیزبایەتیی ناوچەگەریو گیانی نازانستیيەوە. من ئەم سێ کەسایەتییەم وەکو نموونە هەلبژاردووە بۆئەوەی بسەلمێنرێت پڕۆژەی ئینسکلۆپیدیا ڕێی تێدەچێو دەتوانرێ بهێنرێتە دیو هەر زۆریش پێویستە، هەرچەند سەرئێشەی زۆرە.

ئەم نووسینە، نەیتوانیوە بەباشی سوود لەشەپۆلی بلاوکراوە نوێکان وەرگرێت. لەدەرەوەی ولاتیشدا هێشتا ئینستیتووتێك نییە، کە دوا بلاوکراوەی تێدا کۆکرابێتەوە. ئەگەریش هەبێ وەکو ( بەرلین و پاریس)، کەس یان لایەنێك لەناوەوەی ولاتەوە ناتوانێ ئەرکی کتێب ڕەوانە کردن بۆ ئەو ئینستیتووتانە بگرێتە ئەستۆ.

## ژێدەر و پەراوێزی

## پێشەکی

١. مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد): پێکهاتنی چوارچێوەی ئابووری‌و سیاسیی چینی بۆرجوازی لەشاری سلێمانیدا (١٨٢٠ ـ ١٩٢٠) سلێمانی ـ ٢٠٠٣.

٢. نەریمان، مستەفا (بڵاوکردنەوە: ئازاد هیدایەت دەلۆ): چەند بەڵگەیەکی مێژوویی ـ گۆڤاری رامان، ژمارە (٦٧) هەولێر ـ ٢٠٠٢، ل ٢٢٦.

٣. خەزنەدار، د. مارف: مێژووی ئەدەبی کوردی، ب ٣ دەزگای ئاراس ـ هەولێر ٢٠٠٣، ل١٤٦.

٤. کاك حەمەبۆر دەسنووسێکی زۆری هەبووەو سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی پێشوو، زۆربەی زۆری وەکو درکی ناو ئاردی لێهاتووە، خۆیشی نازانێ چییان لێ بەسەرهاتووە.

5. Berliner, R. und Borchardt.

٦. یوسف، عبدالرقیب‌و ساڵح، سدیق: تۆمارێکی شارەوانی سلێمانی ١٩٢٣ ـ ١٩٢٤ سلێمانی ـ ٢٠٠٤.

٧. ساڵح، سدیق: تۆمارێکی شارەانی سلێمانی (١٩١٩ ـ ١٩٢٢) سلێمانی ـ ٢٠٠٣.

٨. زەنگەنە، عەبدوڵلا (ئامادەکردن‌و لێکۆڵینەوە): گۆڤاری رۆژی کورد. بنکەی ژین ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٥.

٩. العزاوی، عباس: شهروز ـ السلیمانیة (اللواء والمدینة)راجعه وقدم له وعلق علیه (محمد علي القرداغي) بغداد ـ ٢٠٠٠.

١٠. بابی لالۆ (محەمەد، کەمال رەئووف): دەستەوارەیی نان بۆ مێژوو، ب١، سلێمانی ٢٠٠٤.

١١. ساڵحی رەشە، ئەکرەم: شاری سلێمانی ـ بغداد ب١ ١٩٨٧، ب٢ ١٩٨٨.

١٢. ئەمین، نەوشیروان مستەفا: سەردەمی قەڵەم‌و موراجەعات، سلێمانی، دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩.

ـ ئەمین، نەوشیروان مستەفا، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی رۆژنامەوانی کوردی، ب١ ب٢، سلێمانی ٢٠٠١.

## ژێدەر و پەراوێز :

١ـ سەبارەت بەپێناسەی بۆرجوازی‌و (بوێرگەر) سەرچاوەیەکی یەکجار زۆر هەن، من بەپێویستم نەزانی ناوی یەك بەیەکی سەرچاوەکان بنووسم، ئەوەی زۆر بەسوود بێت ئەو فەرهەنگ‌و ئینسکلۆپیدیا سیاسیی‌و سۆسیۆلۆگی‌و فەلسەفییانەن، کە لەسەر ئەم بابەتیان نووسیوە‌و نرخی خۆیان هەیە.

بۆ نموونە: Sandkueler : Handbuch der Soziologie

بڕوانە ئەم بەشانەی خوارەوە:

Bourgeoisie S.429 Michael Neuumann :Bürger

٢ ـ الوردی، علی: طبیعة المجتمع العراقي ، بغداد ١٩٦٥، ص٢٨

٣ ـ دەربارەی یەکگرتنەوەی "نەتەوەیی" ئەڵمانیا بەهەزاران سەرچاوە هەن. ناوهێنانی ژێدەرو سەرچاوە ڕەنگە ببێتە مایەی قەبە بوونی نووسینەکە.

٤ ـ عەزیز ئاغا، ئەحمەد: خواص‌و عوام، رۆژنامەی ژیان ژمارە (٨) ساڵی (١) ١١ی مارتی ١٩٢٦ سلێمانی ل (٢) دووبارە بڵاوکردنەوەی رەفیق ساڵح‌و سدیق ساڵح، سلێمانی.

5- Weber, Max: Wirtschaft und Gesellschaft Tubingen 1985, S, 728

6- Weber, Max; ibid. S. 88

٧ ـ الوردي، علي: لمحات إجتماعية من تأريخ العراق الحديث. بغداد ج١، ج٢،ج٣ ،ج٤،ج٥ ، ١٩٧٨.

8- Rich, Claudius James: Narrative of a Residence in Koordistan, London, 1836, P. 95.

٩ ـ شار وەکو دوورگەی ئازادی بووە بۆ ئەو جووتیارو پاڵەو سەپانانەی توانیویانە لەدەست دەرەبەگەکان خۆیان رزگار بکەن‌و خۆیان بگەیێننە شار.

10- Edmonds , C.J : Kurd , Turk and Arabs . London 1957.

11- Batatu , Hanna : The old social classes and the revolutionary Movements of Irak, Princeton 1987 . P 263

12- Olson , Robert W: The Siege of Mlosul and Othman – Persian Relations 1718 – 1743, Bloomington . 1975 , P. 7

13- Olson , Robert W: ibid , P , 30

14- Batatu, Hanna : ibid. 263

١٥ ـ ئەکرەمی محمودی ساڵحی ڕەشە: سلێمانی، بغداد، ١٩٨٧، ل ٣٩٦.

١٦ ـ دانیشتنێك لەگەڵ احمد خواجه. سلێمانی ٢٥/١٠/١٩٩٥.

١٧ـ میجرسۆن دەنووسێ: گوتیان ساڵی ١٨٨٠ ز (٥٠) کلدانییەکی موسڵاویو بیست فارسی هەمەدانی لەشاری سلێمانیدا جێگیر ببوون.

18- Rich , C, J : Narrative of a Rsidence in koordidtan, band I , london , 1836 . P 95

بابانەکان خۆیان بەعەشایەر داناوەو رقیان لەخوو ڕەوشتی شاری بووەو جێگەی گاڵتەیان بووە. تەنانەت ئەو میرانەی زۆر لەشاران ماونەتەوە پێیان وابووە، کە وەکو بازرگانیان لێ هاتووە.

١٩ ـ محمد أمين زكي: تأريخ السليمانية وأنحائها، ت (جميل بندى الروژبيانى)، بغداد، ١٩٥١، ص ١٦٩.

٢٠ ـ حسن، محمد سلمان: التطور الاقتصادي في العراق، بيروت ـ ١٩٦٥ ص ٥٣.

21- Engel mann, Bernt: Wir Untertanen.
München, 1982, S65ff.

٢٢ ـ حەکیم، هەڵکەوت: چەند سەرنجێکی سەرەتایی دەربارەی دروست بوونی شاری سلێمانی. لە: گۆڤاری هیوا ژ(٢) مایس ١٩٨٤، پاریس ل٧٢.

٢٣ ـ زەکی، محەمەد ئەمین: تاریخی سلێمانی وە ولاتی ـ سەرجەمی بەرهەمەکانی ـ سێیەم بەرگ ـ ئامادەکردنی رەفیق ساڵح ـ بنکەی ژین ـ سلێمانی ٢٠٠٦، ل ١٢٢ ـ ١٢٣.

٢٤ ـ بڕوانە: عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان: رەوشی کوردان ـ سیر الاکراد. بلاوکردنەوەی: محمد رئوفی توکلی. وەرگێڕان: کەریمی حیسامی. ستوکهوڵم، ١٩٩١، ل ١١٩.

٢٥ ـ زەکی، محەمەد ئەمین (س. پ) ل ١٤٩.

٢٦ ـ محمد سلمان حسن.

27- Rich: ibid. P 320

٢٨ ـ هلکوت حکیم: ابعاد ظهور الطریقة النقشبندیة فی کردستان، دراسات کردیة، العدد ١، پاریس، ١٩٨٤، ص٥٥.

٢٩ ـ سالم: دیوانی سالم ، هەولێر، ١٩٧٣.

٣٠ ـ سالم شیعری تری هەیە، کە ئاماژەی زۆر گرنگی تێدایە بۆ بارودۆخی سیاسیی‌و ئابووری دوا قۆناغی میرایەتی بابان، بەداخەوە بەهۆی بلاو نەکردنەوەی دیوانەکە بەشێوەیەکی عیلمی ناتوانرێ باش سوودی لێ وەربگیرێت. هەر بۆ نموونە ئەم بەیتەی خوارەوە قسەی زۆری لەسەرە:

**کەس نەچێتە پێشەوە، حاجی غەنی تەدبیرییە**

**مەئموری سەبتی نفووسەو شاغیلی باجی دوکان**

مامۆستا جەمال بابان دەڵێ: حاجی غەنی لەکاتی فەرمانڕەوایی ئەحمەد پاشای باباندا پیاوێکی دەوڵەمەند بووە بڕوانە.

جمال بابان: نەخشەی شاری سلێمانی لەسەردەمی بابانەکاندا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری. حیلمی تۆزێ باسی ئەم شیعرەی لە کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی) بەرگی دووەمدا کردووە. بەغداد ١٩٥٦ ل.٦١.

بۆئەوەی زیاتر ڕووناکی بخرێتە سەر ئەم بەیتە نامەیەکم بۆ مامۆستا (محەمەدی مەلا کەریم) نووسی ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە، کە وەکو خۆی دەینووسمەوە، بەبێ دەستکاری، یەك دوو ووشەی نەخوێنرایەوە، چەند خاڵێك لەبریان دانران.

(لەبارەی شیعرەکەی سالمەوە، من تەنها ئەم جارە لەژیانما کورتە چاوێکم بەو چامەیەدا گێڕاوە، لام وایە ئەوەو چامەیەکی تری سالم هەر لەو وەزنەو لەو بابەتە، بەڵام لەقافییەیەکی تردا، بایەخێکی زۆریان بۆ زانینی باری سلێمانی ئەو ڕۆژە هەیە. چامەکە دەیان ناوی تریشی تیایە کە پێویستیان بەناسینەوەو ساغکردنەوە هەیە، لام وایە کاتیشی بەسەر چوو بێ.

لەشەرحە ئامادە کراوەکەی باوکم‌و کاکەمدا لەسەر سالم هەر ئەوەندە وتراوە (کەس نەچێتە پێشەوە، حاجی غەنی ئیشی هەیەو خەریکی راوێژو تەکبیرە، سەری لێ تێك نەدەن، خەریکی جێگیر نفووسەو باجی دووکانەکان رێك ئەخات) لە (جەمال بابان)م پرسی، هیچی نوێتری لەوەی لەگۆڤاری کوڕدا نووسیویە لانەبوو، لەکاك (حەمە بۆر)م پرسی، کە سەرچاوەی گەلێ لایەو شارەزایەکی باشی سلێمانیی کۆنیشە، وتی: حاجی غەنی کوڕی حاجی خدر، خەڵکی گەڕەکی مەڵکەندی، پاشان باجگری کەڵکی دووکان بووە، ئەوجا بووە بەباجگرو کاسبانەی لەدووکاندارەکان سەندووە، لەسەردەمی رۆمدا بووە بەمەئمووری نفووس، کوڕێکی لێ بەجێ مابوو، من خۆم (واتە حەمە بۆر) دیومە، ناوی خلە باجگر بوو، دیارە ئەم (حاجی غەنی)یە کابرایەکی دژ بەبنەماڵەی میرانی بابان بووە، بۆیە سالم وا ناوی هێناوە).

بالمناسبە، ئەو شەرحی دیوانی سالمە کە باوکم‌و کاکم ئامادەیان کردووە هێشتا تەواو نەبووە، من خۆم ئێستا دەستم بەکەشکۆڵی محمود پاشای جافەوە گیراوە، کە ئەگەر مام‌و لەوە بوومەوە خەریکی سالمەکە ئەبم، بەڵکو تاگورێکم ماوە ساغی

کەمەوەو بەچاپی بگەیەنین، لام وا نییە ئەم شیعرانەی سالم بەر نەتەویستی؟[*] (کاسبهای شهری) بکەوێ، چونکە لەهەمان قەسیدەدا شانازی بەکەسانێکی تری سەردەمی بابانەکانەوە ئەکا کە رۆمەکان لەسەردەمی خۆیانا گۆڕیویانن بەکەسانی تری ناشایستە، سەبتی نفووسی ئەو سەردەمەیش شتێکی تێکڕایی بووە، لەخێڵەکانا بۆ سەرانەی حەیوانو لەناو فەلاحا بۆ موڵکانەو لەشارەکانا بۆ کاسبانە لێ سەندن، (تەدبیری)یش واتە سەری قاڵەو دەستی گیراوە، ئەی چۆن سەری قاڵ نابێ، ئەو کەسە سەرژمێری خەڵکی لە ئەستۆدا بێو باجی دووکانەکانی شار وەربگرێ، ئەبێ سەری قاڵ بێتو کەس دەرفەتی نەبێ بڕواتە لایی ببینێ، ئەم بەیتەو گەلێکی زیاتریش لەچاپەکەی گیوو لەو دەستنووسانەدا هەن کە لای ئێمەو لای حەمە بۆر هەن.

نامەکە ١٩٩٦/٣/٢٦ نووسراوەو دوا دێڕ نەنیشانەی پرسیاری لەسەرەو نەمەبەستەکەش ڕوونەو چۆنم بۆ خوێنراوەتەوە وام نووسیووە.

٣١ ـ وەکو لەپێشەکیدا ئاماژەم بۆ کردووە ئەم بەیتەو بەیتەکانی تریش لەمێژووی ئەدەبی کوردی ـ د. مارف خەزنەدار وەرگیراون.

٣٢ ـ سلطانی، محمد علی احزاب سیاسیی انجمن های سری در کرمانشاه، جلد أول، تهران ١٣٧٨، ص٣٨.

٣٣ ـ زێوەر لە گەنجینەی مەرداندا دەنووسێ :

(حەزرەتی کاك احمد بۆ خدمەتی ئایندەو ڕەوەندو مریدانی تەنها واریداتی ئاشێکی بوو لەسەیداوا. فەرمانی زەکاتی پێنج دێ وەك نۆدێ، عازەبان، بزەینیان، وێڵەدەر، خەراجیانی بۆ نووسی کە وەقفی دەرگای کاك احمد بێ بۆ مەسرەفی میوانو مریدانی.) بەغدا، ١٩٨٥ ، ل ٥٦.

---

[*] لەدەقی نامەکەی مامۆستادا، ئەم وشەیە بەهەمان شێوە هاتووە کە ئێمە دامان ناوەتەوە، بەڵام ڕەنگە مەبەستی (نەتویستی) بێت.

واته داهاتی کاك (ئەحمدی شێخ) لەسەرەتادا داهاتی ئاشێك بووەو پاشان سوڵتان (عبدالحمیدی دووەم) وەقفی پێنج گوندی بۆ تەرخان کردووه واته: پەیوەندی سیاسیی لەگەڵ ناوەندی دەسەڵاتدا دەوری بینیوه لەفراوان کردنی سنوری وەقف.

34- Soane, E. B.: To Mesopotamia and Kurdistan in disguise. 2A1 London 1979 P. 186.

٣٥ ـ بابی لالۆ (محەمەد، کەمال رەئووف): (س. پ) ل ١٥ ـ ٢٧.

36- Batatu, Hanna: Ibid. The Notable of Sulaimany P. 291.

٣٧ ـ هەرچی زانیاری هەریەکه لەم بەشەدا بڵاوکراوەتەوه لەنووسراوەکانی مامۆستا سدیق ساڵحو رەفیق ساڵحو عەبدلخالید سابیر وەرگیراون.

٣٨ ـ نامەی مامۆستا (محەمەد رەسوول هاوار) ڕۆژی ١٩٩٦/٣/٥ بێگومان زانیاری تریش لەسەر ئەم کەسایەتییە ئابووریانه زۆرنو چاکتر وایه نووسەرانی شاری سلێمانی پەیوەندی بەو بنەماڵانەوه بکەن کە بۆ تۆمار کردنی زانیاری وردترو پەیدا کردنی فاکتو دۆکۆمێنت لەسەر ئەمانەو کەسانی تری وەکو (کەریمی ئەلەکە)و (حاجی سەعیدی کەرکوکی زادە) (هەردووکیان زەمانی شێخ مەحموود وەزیر بوون)و دەیان کەسایەتی تریش هەن دەبێ مێژوو لایان لێ بکاتەوه.

٣٩ ـ یوسف، عبدالرقیبو سدیق ساڵح: لەبەڵگەنامەکانی حکومەتی شێخ مەحمود. تۆمارێکی شاری سلێمانی ١٩٢٣ـ ١٩٢٤، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٤، ل٢٤

٤٠ ـ سابیر،عەبدلخالید: سەرۆك شارەوانییەکانی سلێمانی (١٨٩٠ ـ ٢٠٠٣). شارەوانی سلێمانی، سلێمانی ٢٠٠٣ ل٧٠.

٤١ ـ دانیشتنێك لەگەڵ کاك جەمال حەکیم رۆژی ٢٠٠٦/٢/٨.

ـ دانیشتنێك لەگەڵ کاك صدیق صالح ڕۆژی ٢٠٠٦/٢/١٨.

ـ العزاوی، عباس: التأريخ العراق بين أحتلالين، ج٨، بغداد ١٩٥٦، ص(١٦٥ ـ ١٧٣).

ـ (لەوەدەچێ زانیارییەکەی عەباس عەزاوی سەبارەت بەدووجار هەڵبژاردنی حاجی مەلا سەعید کەرکوکی زادە، راست نەبێت. ڕێی تێ ناچێت لەماوەی دوو هەفتەی ساڵی ١٩٠٨ دووجار هەڵبژاردن بۆ ((مجلس مبعوثان)) رووی دابێت ...).

٤٢ ـ ئەحمەد تۆفیق بەگ، ڕۆژنامەی ژیان.

٤٣ ـ ڕەفیق حیلمی: یاداشت، بەرگی یەکەم. چ.٢. بەغدا ١٩٨٨ ل٣٦.

٤٤ ـ زێوەر، مەلا عەبدوڵڵا (س. پ)، ل ١٣٠.

٤٥ ـ ئەم شیعرەی مەلا حەمدوون هێشتا بڵاونەکراوەتەوە.

٤٦ ـ سلطانی، محمد علی: احزاب وانجمنها سری در کرمانشاه، جلد أول، تهران ١٣٧٨، ص٣٨.

٤٧ ـ بابی لالۆ (محەمەد، کەمال رەئووف): (س. پ) ل ١٥ ـ ٢٧.

48- Soane, E.b: ibid P. 189

49- Edmonds, C.j: ibid. P 80

٥٠ ـ د. كمال مظهر احمد: دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، بغداد، ١٩٧٨، ص ٣٥.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەم زانیارییەی لەڕاپۆرتێکدا وەرگرتووە، کە یەکێك لەئەفسەرە بەریتانییەکان دایڕشتووە، بریا ڕووناکبیرانی کورد بەشێك لەبەڵگەنامەکانی (المركز الوطني للوثائق) وەرگێڕنە سەر کوردی. من خۆم ئێستا لەم جۆرە بەڵگەنامانەو ژمارەکانی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)و تێگەیشتنی ڕاستی... هتد، دوورم.

٥١ ـ کاك سیامەند عوسمان دەنووسێ: (إن لضعف الشريحة التجارية الكردية و غيابها الشبه كلي عن ميلاد الحركة القومية الكردية مدلولات تأريخية و سياسية لم يقم الباحثين، ياللاسف، بسبر أغوارها، إذا إنها تؤشر، ضمن مؤشراتها الاخرى،

الى خطأ الرأي الاورو مركزي الزاعم وجود (البرجوازية) على رأس الحركة القومية الكردية عشية ميلادها، و إلا كيف يمكن التحدث عن البرجوازية الكردية) فى غياب التجار الاكراد؟ إننا لم نجد فى دراستنا للمجتمع الكردي، لا في القرن التاسع عشر ولا في العقود الاولى من هذا القرن، على اي دليل ملموس يشير الى وجود إصطفاف مجتمعي تجاري تعرف نفسها كردياً، أي تقدم المطاليب القومية الكردية وتلعب دوراً لتحقيقها). سيامند. عثمان: ملاحظات تأريخية حول نشأة الحركة القومية الكردية. في: دراسات كردية. ع (١) باريس، ١٩٨٤، ص ٢٦ ز.

٥٢ ـ نامەیەکی مامۆستا (محەمەدی مەلا کەریم) ڕۆژو ساڵی لەسەر نەنووسراوە.

٥٣ ـ نامەی ژ ١٤٢ بۆ شێخ عەلی قازی ـ سلێمانی ـ بەفارسی نووسراوە: (آخر درین شهرهای إسلام زمزمەء ارشاد و خلفای این بی مراد بمسامع دورو نزدیك رسیدە أست، تنها اهل سلیمانیە كە وطن مألوف إین بقصور موصوف است، با وجود رغبت بندگان خادم خاندان علیە این قدر افسردە و بی بهرە باشند از وحشتی وبیم مصیبتی خالی نیست).

بڕوانە: مەلا عبدالکریمی مدرس: یادی مەردان، بغداد، ١٩٧٩ ، ل ٢٧١.

٥٤ ـ پێناسەی کەرکوك بەگوێرەی (قاموس الاعلام) چەندین جار بەکوردیو عەرەبی بڵاوکراوەتەوە، من هەرچەند دەقەکەی شمس الدین سامیشم بینیوە، بەڵام لەم نووسینەدا وتارێکی د.جەمال ڕەشیدم لەبەر دەستدایە: کەرکوك لەچەرخە کۆنەکاندا: سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠) ، هەولێر، هاوینی ٢٠٠١، ل٦٤.

٥٥ ـ ریچ، کلۆدیۆس: (سپ) من بڕگەیەکم لەوەرگێڕانەکەی (محەمەدی حەمە باقی) گواستۆتەوە. (گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠)، تەورێز ١٩٩٢ ل١١٣.

(نەدەبا کاکە حەمە ناوی وەرگێڕی عەرەبی فەرامۆش بکاتو هیچ ئاماژەیەك بۆ وەرگێڕانی کوردییەکەی ڕۆژنامەی پێشکەوتن نەکات).

٥٦ ـ هاوار، محەمەد رەسول: شێخ مەحموودی قارەمانو دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان (بـ١ لەندەن ١٩٩٠ ل٩٧)

٥٧ ـ مامۆستا (کەریم احمد) لەدانیشتنێکدا ١٩٩٤/٤/١٤ پیێ گوتم: (بازرگانەکان لایەنگری ئەوە نەبوون، کوردستان دەبێ بەعیراقەوە گرێ بدرێت، بەپێچەوانەوە ئەوان لایەنگری ئەوە بوون کوردستانێکی سەربەخۆ لەبن ئالآی سەرکردایەتی ئەواندا دروست بێت، بەڵام ئەوان لەبەرئەوەی لەڕووی ئابووریو سیاسییەوە لاواز بوون، بەلایانەوە گرنگ بوو لەبازاڕی عیراق دانەبڕێن).

٥٨ ـ د.کمال مظهر احمد: (المصدر السابق)، ص ٢٩.

٥٩ ـ بڕوانە: هاوار(سەرچاوەی پێشوو) ل ٥٠٥ ب. د ئەکرەمی مەحمودی ساڵحی ڕەشە (س.پ).

ـ رەفیق ساڵحو سدیق ساڵح: ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (١٢) ـ ١٢ نیسانی ١٩٢٦ ـ سلێمانی ٢٠٠٢ ل٢.

٦٠ ـ ڕۆژی کوردستان: (کۆکردنەوەو دووبارە بڵاوکردنەوە جەمال خەزنەدار)، بەغدا، ١٩٧٣.

ـ ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان ژمارە (٨)، تشرینی ٢ی ١٩٢٢ز ، ئامادەکردن (رەفیق ساڵحو سدیق ساڵح): ڕۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحموود ـ سلێمانی ٢٠٠٣.

٦١ ـ غەفووری میرزا کەریم: کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانی، بەغداد، ١٩٨، ل ٢٢، ب.د.

٦٢- لەژمارە (٥)ی رۆژی کوردستان هەواڵی تیرۆر کردنی جەمال عیرفان بڵاوکراوەتەوە (ضیاعیکی گەورە). لەژمارەی (١١) نێوی حەمە بچکۆل هاتووە

لەلیستەی پیتاککەراندا (پیاوی حضرة رئیس الرؤسا شیَخ قادر)و ١٠ روپییەی داوە. لەژمارەی (٨) نێوی (جناب محمد اغا (حمه بچکۆل) لێرەشدا (٥٠) روپییەی داوە. بەشێك لەنووسەرانی کورد راستو ڕەوان نووسیویانە حەمە بچکۆل بکوژی جەمال عیرفانە، بەلاّم من لەوە دلّنیا نیم ئەم دوو حەمە بچکۆلەی نێو لیستی پیتاککەران یەکێکنو هەمان تیرۆرکەری جەمال عیرفانە؟

کاك فوئادی مەجید میسری لە ١٩٩٤/١/٢٧ نامەیەکی بۆ نووسیبووم سەبارەت بەشێك لە باکگراوندەکانی کوشتنی جەمال عیرفان: (نائیلە عیرفان) کە خوشکی (جەمال عیرفان)ەو بۆ خۆم گفتوگۆم لەگەلّ کردووە، لەوەلاّمی ئەو پرسیارەدا کە ئاخۆ تا چەند ئاگای لە کوشتنی هەیە؟ وتی:

((حەمە بچکۆلی مەرگەیی کە زاوای ماجد مستەفایە، کاکمی کوشت. تایەری ئەمینە فەنی مەسرەف کە سەرۆکی دیوانی مەلەکی شێخ محمود بوو، خالّی ژنەکەی حەمە بچکۆل!! هەروەها ئەیووت: ئێمە لەدوای دوو رۆژ زانیمان تاوانبارەکان کێن)) ئەمڕۆش پاش ٨٤ سالّ نووسەرانی کورد ناوێرن خۆیان لەقەرەی ڕاستی بدەنو لێتۆێژنەوەو لێپێچانەوەیەکی زانستی/ دیتەکتیف detective واتە: کاری بەدواداچوونو شیکاری پۆلیسی لەسەر ڕووداوەکە بنووسن، ڕەنگە هەندێك لەوانە پێیان وا بێت بەهەلّکردنی گەردەلوولی لێپێچانەوەی، چەمکی کەوای هەندێ لایەنی سیاسیی گەردی بەرکەوێ.!!

٦٣- رەفیق حیلمی: (سەرچاوەی پێشوو)، ل٦٨.

٦٤- د.مکرم تالّەبانی: شێخ ڕەزای تالّەبانی، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٥٠.

هیوادارم ڕۆژێك دەستم بپەرژێت بتوانم لەسەر ئەم (نامۆ بوون)ە کۆمەلاّیەتی ـ سیاسیی ـ فەرهەنگییەی شێخ ڕەزاو خومیس ئەفەندی بنووسم وەکو بەشێك لەسەرجەمی بیرکردنەوەی سیاسیی شێخ ڕەزا.

٦٥- هەروەکو چۆن بیرکردنەوەی سیاسیی شێخ ڕەزا، لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر نەنووسراوە، مێژوو نووس (محمد امین زەکی بەگ)یش گرنگی بەسەرجەمی بیرکردنەوەی سیاسیی نەداوە.

٦٦- محمد امین زەکی: (المصدر السابق)، ص ٢٤٣.

٦٧- بابان زادە، ئیسماعیل حەقی: (ئیسلامییەتیو کوردایەتی) گۆڤاری (ڕۆژی کورد) ئەستەموول (١٩١٣). دووبارە بڵاوکردنەوە لەلایەن عەبدوڵڵا زەنگەنە. بنکەی ژین. سلێمانی ٢٠٠٥ ل٧.

ئیسماعیل حەقی بابان، کوڕی مستەفا زهنی پاشایە، کە باوكو کوڕە بەزیرەکیو ژیرو ڕووناکبیر ناویان ڕۆیشتووە. (ئیسماعیل حەقی) چەندین کتێبی بەتورکی بڵاوکردووەتەوەو بیروباوەڕی ئەو جێگەی دانوستاندن بووە لەکۆمەڵی ئەوسای دەوڵەتی عوسمانیدا. مەخابن لەسەر ئەم دوو کەسایەتییەش (ئەمڕۆ) هیچیان لەسەر نازانرێت.

٦٨- نامەکەی هاوارو کتێبی سلێمانیو یادداشتی ڕەفیق حیلمی.

٦٩- حەمدی پۆستی وەزیری نەبووەو بەڕێوبەری گومرگ بووە، بەڵام ئەو خۆی بەوەزیر داناوەو بەشداری کۆبوونەوەکانی کردووە، بڕوانە ڕەفیق حیلمی، بەرگ ٢ ، ل ٥٢٥.

## پەیدابوونی کۆکراوە

من لەهاوینی ١٩١٦دا وەکو وەرگێڕی شاندێکی سەربازی (ئەڵمانی ـ تورکی) هاتم بۆ سلێمانی، کە دەکەوێتە کوردستان. لێرەوە، گەشتێکم بۆ کوردستانی ئێران کرد. لەساڵی ١٩١٨ دەرفەتم بۆ هاتە پێشەوەو سەردانێکی کوردەکانی زاخۆشم کرد، کە دەکەوێتە باکووری مووسڵەوە.

ئەو کارەی پێم سپێرابوو، پەیوەندیو ئاشنایەتی زۆری لەگەڵ دانیشتوانی ئەوێدا بۆ پەیدا کردم. من میوانێکی هەمیشەیی بازاڕ بووم. ئەوەی ڕاستی بێت، کاری دەستی زیو، هەر زۆر سەرنجی ڕاکێشام. چەندین سەعاتم لەناو کارگەو جێگاکانی ئەواندا بەسەر دەبردو پاش چەند مانگێك دۆستایەتییەکی زۆر باشم لەگەڵیاندا پەیدا کرد. ئەوان بەشانازییەکی زۆرەوە هونەری خۆیان پیشاندەدام. کاتێك من بەکاوەخۆ دەستم بەکڕینی زیو کرد، هەندێکیان پارچە کۆنی زۆر باشیان لەماڵەوە بۆ هێنام، کە لەماڵەوە بۆ خۆیان پاراستبوویان. ئەمانە باوكو باپیرانیشیان هەر بەکاری زیوگەری ژیاونو لەوانەوە پیشەکەیان بۆ ماوەتەوە. ئەوەندە شارەزابوون، سەیری هەر کارێکی دەستی زیویان بکردایە، یەکسەر بەبێ کەمو زیاد تەمەنی ئەو کارەیان پێ دەگوتیت. جێگەی سەرسووڕمان بوو، ئەوان بەگەرمیو بەدڵو گیان کاری خۆیان ئەنجام دەدا. بەگشتی ئەوان پێشەکی ئەوەیان زۆر چاك دەزانی، ئەو پارچە زیوەی کە کاری لەسەر دەکەن، پارچەیەکی نوێ دروست دەکەن، یان پارچەیەکی کۆنەو تەنیا مشتوماڵی دەکەن. ئەوان بەبێ پێچو پەنا هەناسەی خەفەتیان بۆ ئەوە هەڵدەکێشا، کە ئێستا لەتوانایاندا نییە وەکو جاری جاران دەستڕەنگینیو هونەری زیوکاری بنوێننو پارچەی جوان پێشکەشی کڕیار بکەن.

لەم کاتەدا، شەڕو پێکدادانو برسێتیو قاتو قڕی، بڕستی لەخەڵك سەندبوو، ئەم هەلو مەرجەدا بۆ پڕۆژەی کۆکردنەوەکانی من، هەر زۆر لەبارو گونجاو بوو. خێزانە کوردە دەوڵەمەندەکان، ناچاربوون خشڵی کۆنی ژنەکانیان، کە پاشەکەوتیان کردبوو، بەرامبەر پارەی زیو ئاڵوگۆڕی پێ بکەن. لەئاسیادا، ئەوە زۆر باوە، کە خشڵ لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەمێنێتەوەو هەڵدەگیرێت، بۆیە ئەو خشڵانە بەشێکیان پارچەی زۆر کۆنی تێدایە[1].

بەشێك لەو پارچە خشڵە کۆنانە، توێنرانەوە. من توانیم ژمارەیەکی زۆر خشڵی کۆن لەناو مەنجەڵی توانەوەدا ڕزگار بکەم.

نرخی مسقاڵێك (٤,٦ گرام) بەگوێرەی جۆری زیوەکەیو ئەو کارەی تێیدا کراوە لەنێوان ١,١/٤ و ٢ لیرەی عوسمانی دراوی قورس، کڕینو فرۆشی پێدەکرا.

لەئەڵمانیادا، لیرەی تورکی زیو، لەچاو قرانی ئێرانی لەکاتی شەڕ لێدراودا، ڕەواجی زۆرترە، چونکە لێرە شارەزاییەکی باشیان دەربارەی تێکەڵاوکردنو تواندنەوەی مەعدەنی جۆراوجۆر نییە. ئەم خاڵە نەبووە بەرێگرێك لەبەردەم ئەواندا، قرانەکان سەرلەنوێ وەکو خشڵ بەکاربهێنرێت.

لەوەدەستخستنی ئەم خشڵانەدا، هەوڵمداوە بەگوێرەی توانا، زنجیرەی گەشەکردنی هونەری زەخرەفە پێکەوە گرێبدەم. شتێکی هەر زۆر سەرنجڕاکێشە، گەر بزانرێت، چۆن زەخرەفەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت! لەهەمان کاتدا، تەکنیکی کاری پیشەیی لەسەردەمی نوێدا بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە. لێرە لەناوچە سنوورییەکاندا، کە هەر جارێك لەبن دەسەڵاتی ئێران یان تورکدا دەستاودەستیان پێکراوە، لەو شوێنانەدا، کاری زیوگەری بەشێوەیەکی گشتی فارسی، یان کوردی یان (جو)ی میزابواتامیایی بووە. لەم ڕووەوە گەلی کورد، کە دانیشتوانی ڕەسەنی ئەم وڵاتەن، خاوەن کولتوورێکی پێشکەوتوونین، تێگەیشتنی

---

[1] s. auch H. Vàmbéry, Skizzen aus Mittelasien, Leipzig 1867. s. 35.

ئەم بارە کولتوورییە هەر زۆر ئاسانە، خشڵە کوردییەکان ماك‌و شەقڵی کولتووری جیا جیایان پێوە دیارە.

کاتێك لەبەغداوە گەڕامەوە، چەند پارچەیەك خشڵم لێ بزر بوو. هەرچی کۆکراوەم هەبوو، لەمانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۱۸دا لەئەستەمبووڵ دەستی بەسەردا گیراو لەتشرینی یەکەمی ۱۹۲۱دا سەرلەنوێ بۆیان گێڕامەوە. زۆربەی زۆری پارچەکانم گەیاندە ئەڵمانیا، سەرەڕای ئەو هەموو دەردەسەرییەی کە تووشم هاتن، ئەوەی لەگەڵ خۆمدا هێناومن، یەك لەدوا یەك وێنەکان دانراون‌و بۆئەوەی بۆ هەمووان دەرگای بینینیانکراوە بێت.

## جێگەی کۆکردنەوە

سلێمانییە شارێکی تورکییەو پایتەختی ویلایەتێکەو هاوناوی سەنجەقێکە لەکوردستان، کە لەسنووری دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانییەوە نزیکەو لەڕووی ئیدارییەوە سەر بەویلایەتی موسڵە. ئەم شارە دەکەوێتە بناری زنجیرەی شاخی هەورامانەوە (مەبەستی نووسەر گۆیژەو ئەزمڕە - تێبینی وەرگێڕ) لەکوێ دووئاوان: دجلە (مەبەستی سیروان یان تانجەرۆیە - تێبینی وەرگێڕ)و زێی بچووك جیادەبنەوە، هەردووکیان دەڕژێنە ڕووباری دیجلەوە (تیگرس - Tigris).

ئەم شارە، ساڵی ۱۷۸۸ز (۱۷۸٤ - ت. و) لەلایەن برایم پاشاوە ئاوەدان کراوەتەوە. ئێرەی جێگەی پایتەختی پێشوو قەڵاچوالانی گرتووەتەوەو بەناوی سلێمان پاشای والی بەغداوە وەکو ڕێزلێنان ئەم ناوەی بۆ هەڵبژێردراوە. بنچینەی شارەکە لەسەر گردێکی توورەکەڕێژ (دەستکرد) دانراوە، کە دیارە جێگەی

ئاوادانییەکی دێرینو کۆن بووە. دەربارەی میرانی (بابان) لەسەر ئەم گردە دروستکراوە.

کاتێک بناغەی دەربار لێرەدا، هەڵکەنراوە، ئێسکو پرووسکو دراوی کۆن دۆزراوەتەوە.

چەندین گەشتیار سەردانی ئەم شارەیان کردووە. ریچ[2]، کە ساڵی ١٨٢٠ لەوێ بووەو بە ٢٠٠٠ خانووی داناوەو ژمارەی دانیشتوانی بە ١٠٠٠٠ کەس خەملاندووە. پاش ئەوەی ساڵی ١٨٩١ هەمەوەندەکان بەیەکجاری سەرکوتکران (ناوچەکەیان دەکەوێتە نێوان کەرکوکو سلێمانی) شارەکە سەرلەنوێ گەشەکردنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی. بازاڕی داڕوخاو تا ئەمڕۆش ئاوەدان نەکراوەتەوە. ئیدارەی عوسمانی لەم چەند ساڵەی دوایدا سەربازخانەیەکو بینای حکومەتی دروستکرد. دابینکردنی ئاسایشی ڕێگەوبانی بەغدا، بازرگانی بووژاندەوەو بازرگانەکانی دەوڵەمەندتر کرد. ئەم شارە، لەکاتی شەڕدا، وەکو شارێکی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی، ژمارەی خانووەکانی نزیکەی ٢٠٠٠ خانوو دەبێت، مرۆڤ کۆمەڵێک سەرنجو تێڕوانینی زۆر چاکی لادروست دەبێت.

لەڕێگەی سیستمی تۆڕی کەناڵەوە، بەبەردەوامی ئاوی پاکو زۆر باش بەهەموو ماڵان دەگات. ئاودەستی مزگەوتەکان، بەبێ وەستان ئاوی بەخوڕی پێدا دەڕوات.

شاری سلێمانی، لەسۆنگەی شاخو کێوە جوانەکانییەوە، ئاوو هەوای باشو کۆمەڵانی خەڵکی چالاکییەوە، بەپێچەوانەی ناوچەی دەشتایی گەرمیانەوە، خۆشترین مەڵبەندی حەوانەوەیە. بازاڕەکەی تاکە سەرچاوەی ڕەوانەکردنی کاڵاو پێداویستییە ئابوورییەکانی دێهاتی نزیکو ناوچە جیاجیاکانی ئەم دەڤەرەیە. کاڵا بازرگانییە سەرەکییەکان ئەمانەی خوارەوەن: کەتیرە، تووتن، مازوو، سابوون،

[2] Rich, Narrative of a residence in Koordistan, London 1836.

کە بۆ کەرکوك دەنێردرێتو لەوێشەوە رەوانەی بەغدا دەکرێت. لەوێوە ئەم شتانەی خوارەوە دەهێنرێتەوە: خورما، شەکر، چا، قاوەو قوماش. ئەم پیشەوەرانە لەبازاڕدا بەدی دەکرێن: سەراج، پینەچی، پەرەکەر، جۆلا، هەموو جۆرەکانی ئاسنگەریو خومچی..

سەرژمێری دانیشتوانی شارەکە نزیکەی ١٥٠٠٠ کەس دەبێت، کە بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش دەبن:

١٢٧٠٠ کوردی سونی

١٠٠٠ جوو

٢٠٠ مەسیحی

کوردەکان سەر بەعەشیرەتی (بەبە) یان بابانن. بەگوێرەی گێڕانەوەکەی پاشای سلێمانی (بەزمانی ریچ)ەوە، ناوی (بەبە) لەناوی باپیرە هەرە گەورەیانەوە وەرگێراوە، سلێمانی بەبە (بابا)، کە لەساڵی ١٦٧٨ز لایەنگیری عوسمانییەکان بووە دژی ئێران. پایتەختی میرنشین ئەو دەمە لەدارشمانە بووە، لەدامێنی کێوی پشدەر نزیکی سیکینە Sikeneh لەسەر سنووری ئێران. تائەمڕۆش ئەم عەشیرەتە لەوێن، ناوچەیەکی بچووکی خۆیان هەیە. وەکو پاداشتێك بۆ پشتگیری چەکدارانە دژ بەئێرانییەکان، ئەم ناوچەیەی ئێستا داگیریان کردووە پێیان بەخشرا.

جووەکان، هەرەکو خۆیان دەیگێڕنەوە، زۆربەی زۆریان هەر لەزەمانی ئیسرای پەیامبەرەوە (٤٥٨ پێش عیسا) لەم وڵاتەدا نیشتەجێ بوون. بۆ پشتڕاستکردنەوە هیچ بەڵگەی نووسراویان بەدەستەوە نییە. لایارد[٣] لەگەشتەکەیدا، لەنزیك (باشقەڵا) چاوی بەعەشیرەتێکی جووی ڕەوەند کەوتووە.

هەروەکو کوردەکان رەشماڵیان هەڵدابوو، ڕانە مەڕو بزنیان بەخێو دەکرد.

[3] A. H. Layard, Nineveh and Babylon, London 1867, S. 200.

سەرجەمی خەڵکی (جوو)ی کوردستان، بە ١٨٠٠٠ کەس دەخەمڵێنرێت[٤]. نزیکەی ١٠٠٠ جوو لەشاری سلێمانیدا دەژین. زۆربەیان وردە بازرگانن. لەبواری پیشەی زەرنگەریو زیوگەریدا، بازاڕەکەیان بەتەواوی پاوەن کردووە (٣٠ کرێکار). ئەمە هونەرێکە زۆربەی زۆری هاودینەکەیان لەئێرانو میزا پۆتامیادا کاری تێدا دەکەن.

لەهەموو بازاڕەکەدا (٨) دوکانی پیشەوەری هەبوونو (٧)یان جوو بوون. کوردێکی موسوڵمان دوکانێکی (زێڕنگەری ـ ت. و) کردەوەو پاش مانگێك ناچار بوو دایبخات، چونکە کەس بەلای ئەودا نەدەهات.

لای جووەکان هونەری زێڕینگەریو زیوگەری جێگەی ئەوپەڕی ڕێزو تەقدیر کردنە[٥]. لەکتێبی پیرۆزدا، چەند جارێك نێوی زێڕینگەر هاتووەو پاش هەرەسهێنانی دەوڵەتەکەیان، زێڕینگەرەکان بەدونیادا پەرتو بلاوبوونەوە. لەتەلموود باسی جڤاتی (نقابة) زێڕینگەرو زیوگەر لەشاری ئیسکەندەرییە دەکات.

عەشیرەتی کاینوکا Kainuka جوو لەباکووری نیمچە دوورگەی عەرەب لەسەدەی ٦ عیسایی بەشێوەیەکی سەرەکی بەم پیشەیەوە سەرقاڵ بوون.

لەسەرجەمی دەوڵەتە ئیسلامیو لەناوچە هاوسنوورەکانیاندا، هەر لەکۆنەوە تا ئێستا، جووەکان لەهەموو شوێنێکدا خەریکی ئەم پیشەیە بوون. (ئەندری) Andree[٦] ناوی ژمارەیەك لەزێڕینگەرەکانی ولاتە عەرەبیو میزۆپۆتامیاو ئێرانی تۆمار کردووە، کە ئەمانە بەتەنیا بازاڕی کیمیاگەریان پاوەن کردووە[٧].

---

[4] Sixth annual report of the Anglo-Jewish association I878. Ost und West, Berlin I909, S. 576.

[5] The Jewish Encycopedia. New York I902. Artikel; Gold-und Silberschmiede; Kurdistan.

[6] Rich Andree, Volkskunde der Juden, Bielefeld 1887, S. 191.

[7] J. F. Polak, Persien, Leipzig 1865, Bd. II, S. 163.

لەهەمان کاتدا ((دوعا))و متومووررووی ((چاووزار))یان دروست دەکرد، کە لەکارە نهێنییەکانی سەفەری راسیل (Sefer Rasiel)ەوە وەرگیراوە. ئەم ((دوعا))و متومووررووی ((چاووزار))ە لێرەو لەشوێنەکانی تری ڕۆژهەڵاتدا، لەلایەن موسوڵمانەکانەوە بۆ خۆپاراستن، دەیکرن. تەنیا ئەوە نەبێ لەم وڵاتەدا ناوی یاهوا ((Jahovah))ی ـ یاهوو ـ لێ دەسڕنەوە.

من بۆ خۆم سێ (دوعا)ی عیبریم بینی، کە لەسەر پێست نووسرابوون.

مەسیحییە کوردەکان، کۆڵەکەی بچووك پێکدەهێنن، بەڵام هەر زۆر پێشەنگو بەرچاون. بەشێك لەمانە بازرگانی دەوڵەمەندو سامانی زۆرو خانووی زۆر جوانیان هەیە.

ئەم نوسینە، پێشەکییەکە بۆ کتێبی (کاری زیوگەری لەکوردستاندا)* نووسەرەکانی (ڕۆدۆڤ بەلینەر)و (پاول بۆرشارد یان بۆرخارد)ەو ساڵی ١٩٢٢ لەبەرلین چاپ کراوە. ئەم کتێبە لەکەتەلۆگی پێشەنگایەکی هونەری دەچێت، کە خشڵی زیوی کوردی تێدا نیشاندراوەو نووسینەکە، کە (٣١) لاپەڕەیەو دەیان وێنەی خشڵی تێدایە، ئێمە تەنیا سێ نمونە دەخەینە بەرچاوان.

*RUDOLF BERLINER & PAUL BORCHARDT:
SILBERSCHMIEDEARBEITEN
AUS KURDISTAN. BERLIN 1922

نمونەی خشڵی سلێمانی ساڵی ١٩٢٠

## غەزەتەی ((العراق))

لەڕۆژنامەی (عیراق)دا لەژمارە ٧٣٨دا چەند شتێکی نووسیوە بەناونیشانی (منشور حزب العراقي)و لەژمارەی ٧٤٣دا بەناونیشانی (مجلس أدارة كردستان) کەوتە بەرچاومان.

گوایە حزبی ڕزگاری عیراقی، داوای پاراستنی هەموو سنوری مافی سروشتی عیراقیەکانی لەحوکمەتی خۆی کردووە. کوردستانیش بەناوی لیوای سلێمانی داغل کردووە، چونکە پەیوەندی بازرگانیو ئابوری لەگەڵ بەغدا زۆرە.

هەروەها ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان بەناوی (ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کوردستان) لەقەڵەم داوە.

ئەم نوسینە کە لەم ڕۆژنامەیەدا نوسراوە، بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانو داخە، چونکە بەخەیاڵی هیچ پیاو چاكو ڕەسەنێكو خاوەن ویژدانێکدا نایە کەسێکی ڕۆشنبیر نکوڵی لەمافمان بکات. ئێمە بەهیچ شێوەیەك چاوەڕوانی ئەوەمان نەدەکرد، کە دراوسێیەکی بەڕێزی خۆمان پێشێلی هەموو بۆنەو مافی هەزار ساڵەی ئەم دوو حکومەتە بکات، لەجیاتی پیرۆزباییو پروپاگەندە بۆ بیروبۆچونەکانمان؛ کەچی سنوری مافمان دەبەزێنێ.

ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە قسانە دەکەن، بێ گومان دوژمنی نیشتمانو میللەتی عەرەبیو حەزرەتی جەلالەتی مەلیکی عیراقن، چونکە ئەم قسانە لەم ڕۆژەدا کە مەسەلەی مەرگو ژیانە، دڵی دۆستو برادەرێکی وەکو ئێمەی پێ دەڕەنجێ.

ئەگەر بەویژدانەوە تەماشای ئەم لاو ئەو لای دەوروبەری خۆیان بکەن، دڵنیا دەبن کە دروستکردنی خێرو خۆشی بۆ عیراق تێدایە.

بگرە بەردەوامی سەربەخۆییو مانەوەی عیراق هەر بە بۆنەی مانەوەی حکومەتی کوردستانەوەیە، لەبەر ئەوەی هەردوو میللەت دراوسێی ئیسلامن کە

هەزار ساڵە بۆنەو مافیان بەسەر یەکەوەیەو هەمیشە وەکو برا ژیاون، پێویستە بۆ پارێزگاری لەسەربەخۆیی‌و ماف‌و سنوری سروشتی یەکتری کە بەدڵ‌و گیان. هەنگاوی دۆستانە بنێن.

مێژووی دنیاو جوگرافیای سروشتی، گەواهێکی دادپەروەرانەیە کە میللەتی کورد لەسەر ئەم زەویە هەموو کات ناونیشانی هەبووە، هەمیشە بوونی خۆی وەکو میللەت سەلماندوە، هیچ کاتێ معارف‌و پیشەسازی‌و بازرگانی‌و مافی مرۆڤ، پێویستییەکانی تری وەکو مرۆڤ؛ مەدەنیەت زەوی‌و نفوس لەمیللەتانی تری وەکو خۆی زیاتر نەبوبێ کەمتر نەبووە.

ئەگرا رۆشنبیرانی عەرەب، تەماشای ئێستاو رابردووی ئەم چەند ســیان بکرادایە، ئەوا ئەم کارەیان نەدەکرد، ئەوسا پێم وا بوو ئەوەندە زیاد شولیان لێ هەڵنەدەکێشا.

یاساو دەستوری سەربەخۆیی میللەتان، بووە بە نەخشێك لەهۆش‌و رۆحی هەموو تاکێکی میللەتاندا ڕەنگ رێژ کراوە، نعمەت‌و ماف‌و سنور کە لەئەنجومەنی نەتەوەکاندا بە دادپەروەری بەش کراوە، ئێمەش بەشمان بەردەکەوێ‌و بۆ بەردەوامی‌و مانەوەی ئەم بەشەمان، بەو هێزە مادی‌و مەعنەوییەمان، بە پێویستی دەزانین ئەو پەڕی فیداکاری پێشکەش بکەین.

باوەڕناکەم لەبیستەمین چەرخی مەدەنییەتدا، کەس بتوانێ بچێتە سەربەشی کەس، بەشانازی‌و سەربەزییەوە دەڵێن ئێمە نەتەوەیەکی پاك‌و بێ باکین دەربەست نایەن‌و زەمانێك کە بەقەزاو قدر توشی فەلاکەت‌و هیلاکی‌و بەزم بووین، جگە لەو هەموو چنگانەی لەم خاکە پاکەو لەم میللەتە خۆش بەختە گیرکرابوو کەچی خۆشبەختانە زوو لەفڕوفێڵ تێ گەیشتین، دەسیسەو گەردن کەچی کەس نەبووین‌و، بەهیچ کلۆجێ لەشیرازەی سنوری مافی

ڕێگەپێدراوی خۆمان دەرنەچووین‌و بەئارەزوو دڵشادی خۆمان، بە سەربەرزی ماوین.

سەد شکور بۆ خودا، ئێستا ڕۆژی لێ کردوینەتەوە، بەهۆی هاوکاری‌و پشتگیری حکومەتی خاوەن شکۆی بەرتیانیاوە ئاسۆی سیاسیمان پاك‌و بێ گەردو بێ خەوشە.

سەردارێکی مەزنی وەکو مەلیکی کوردستان واتە: ملیك (مەحمودی یەکەم)، وەکو دەسکەوت بۆمان زیندوبووەتەوە، ئەمەش لەئەنجامی فیداکاری ئەم چەند ساڵەمان بووە، چۆن ئارەزو بکەین ئەم دەستکەوتانە لەدەست بدەین، چۆن دوای کڵاوی بابردوو دەگەوین. حەزرەتی مەلیك، خودی خۆی ئامانجی پیرۆزی لەپێش هەموو شتێکدا پاراستنی ماف‌و سنوری سروشتی کوردستانە.

هەروەها هەمیشە لەگەڵ دراوسێکانماندا بەشێوازێکی برایانەو بە جوانی‌و بە خێر رامان بواردووە، هەموو دراوسێکانمان کاریگەری باشی ئێمەیان دیووە، چاومان لەبەزاندنی سنورو مافی هیچ میللەتێك نییە، دۆستایەتی‌و برایەتی حکومەتە دراوسێ ئیسلامییەکان ئارەزوومانە، لەگەڵ ئەوەشدا، لەپێناو بستێ خاکی پاکی کوردستان‌و خۆش گوزارەرانی تاکەکانی ئەم میللەتەشدا هەرچی پێویست بکات بۆ فیداکاری‌و کەمتەرخەمی‌و پشتگوێی ناخەین، چیمان پێ بکرێ دەیکەین.

((خاکی پاکی میللەتی کورد مڵکی باوکی خۆیەتی
پێم بڵێن ئەم خەڵکە بۆچی خۆی وەها. بەد ناو ئەکا))

*عارف صائب*[*]

---

[*] عارف صائب: لە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان)ژ(١)، ١٥/ی ت٢/١٩٢٢ سلێمانی دووبارە بڵاوکردنەوەی رەفیق سالح و سدیق سالح: رۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحمود ١٩٢٢-١٩٢٤سلێمانی ٢٠٠٣(لەلایەن ئێمە خراوەتەوە سەر رێنووسی ئەمڕۆو دەستکاری ووشە عەرەبی‌و عوسمانییەکان کراوە)

## عەزیز بەگی بابان

لێم گەڕێن با گۆشەگیربم دەستەو ئەژنۆ کەف زەنان
گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد صفحەی جیهان

بەزمی صەیدی ئێمە صیادی فەلەك کارێکی کرد
رەنگە بالای تیر قەددان بێتە تەرکیبی کەمان

ضعفی طابع جازبە بۆ کارەبا بۆ خوێن‌و دەم
سەیری چیهرەی بەختی من کەن بو بەڕەنگی زەعفەران

نەوبەهاری من خەزانە وەقتەکەی صوبحم تەمووز
پرتەوی ماهە غەمو چاکی دەروونم وەك کەتان

تورکی قورصی خۆر کە طالع بوو طلوعی کرد بەرقص
کەوکەبەی ماهی مورادی اهلی بابان بوو نیهان

دڵ لەمیحنەت کەیلە مەیلی سەیری ناوشارم نیە
عەینی چاوم خوێنی تێزاوە لەداخی مەردومان

ئەهلی بابان گریە کەن بۆ خانەدانو ئاغەتان
نیمی مەحبووس، نیمەیی مەقتوول، نیمی مەنفی کران

کەوڵ بەدۆش، یا خەرقە پۆش بن تاج و کەشکۆڵ هەڵگرن
رووکەنە ئەملاکی ( پیترو ) بچنە شاری خامۆشان

ئاگری نەکبەت لەخەرمەنهایی تالیع کەوتووە
شەمعی دەوڵەت هەر تەرف دەگرا هەموو خامۆش کران

کێ دوعای کردبێ بەسۆز ئەم ساڵ لەگشتی ( شارەزوور )
وا ببارێنی لەتەن خوای تەرزە روویی ئاسمان

راستە گەردوون چابوکە بۆ رەنگی بەدریتن وەلێ
نارژێنێ رەنگی بەم رەنگە بەموددەی سەد قران

حەلقە دەن یاران بلا ئاشفتە بەختو تیرە دڵ
رۆژگار دونیای لەئێمە کرد بەزولف دلبەران

( شارەزوور ) بەحرو ( سلێمانی ) لەسەر ئەم گەمیەرەنگ
بۆ شکستی وەك نەهەنگ بۆ فیتنەیی ئاخر زەمان

صاعقەو بەرقی نحوسەن ضلمتیدا شەرق و غرب
بەردەبارانە بەمەخسووسی لەسەر مولکی بەبان

چاوی عیبرەت هەڵبرە ئەی دڵ لەومزعی دەهری دوون
سەیر کە ساتورکی فەلەك چی کرد بەزومرەی کورد زبان

عەرسەیی مەیدانی چەرخە ئێستە جەولانگاهی بووم
بوو بەلانەی زاغی بەدخوو ئاشیانەی بالەبان

بێ زەبان کوو کوو زەنان هەر خانەدان تێدەفکرم
عەنکەبووت خواجەنشینە جوفتی جوغدە دیدەبان

چارەسەر کەن ئەهلی دەروێش نانی مونعیمتان بڕا
لوولە بوو سفرەو نەواڵە، ون کرا زەرف و خووان

ئەهلی سادات و مەلاو حاجی بلا شین کەن بەسۆز
دەفتەری ئەهلی ومزایف دیم عومووەن حەك کران

حاکمە رۆمی لەسەر تەختی (سلێمانی) درێغ
کەوتە دەستی دێوی دوون موهری سلێمان الامان

هەیە ناوەکانیان (نەقیب، حاجی ئیبراهیم، غەفوور ئاغا)یە کە نزیکەی (٢٠٠) دووکانیان تێدایە، زۆربەی دووکانەکانی ناوشار، بەگڵ دروستکراون، جۆری دووکانەکان (قەصاب، بەقاڵ، سەرتاش، سەوزە فرۆش، تووتنچی، چێشتخانە، کەبابچی، دارتاش، زێڕنگەر، پالاّندروو، جلدروو)وە، لەناو قیسەرییەکاندا دووکانی عەتارو بازرگانو قەزازەکان هەیە. لەدووکانەکاندا کالاّی حەلەبو شامو ئەستەمووڵو شاڵو ئاوریشم دەبینی.

نرخی شتو مەك لێرەدا، لەمووصڵ گرانترە، ئەو قالّییەی لەمووصڵ بەشەش لیرەیە، لەم شارەدا بەنۆ، دە، لێرە دەفرۆشرێ، گەزی کالاّی ئاوریشم بە (٢٠ـ ٢٥) لیرەیە، دانەوێڵەی وەك گەنم، جۆ، برنج زۆر بەگران دەفرۆشرێ، لەناو بازاڕو کووچەو کۆلاّنەکانیشدا چاخانەو قاوەخانە زۆرە، بیناکانیان بەخشتی کاڵ دروستکراوەو زۆر کۆنن‌و بانیان بەدارو تەختە گیراوە، زستانان بەهۆی دووکەڵەوە دیوارو بنمیچەکانیان ڕەش هەڵگەڕاون‌و زۆر تاریکن قەنەفەکانیشیان شڕو شەق‌و بەحەسیرو بەڕەی کۆن راخراون مرۆڤ نایەوێ لەشوێنی وا پیس‌و پۆخڵدا دانشێت‌و وەخت بەرێتە سەر.

لەناو بازاڕدا حەوت‌و لەدەرەوەی بازاڕیشدا هەشت خانی (٦) یەك نهۆمی هەیە، خانەکانی ناو بازاڕ، لەوانەی دەرەوەیان پاك‌و تەمیزترن‌و حەوزی ئاویشیان تێدایەو ژوورەکانیان، بازرگانەکان کردوویانەتە عەمار (مخزن)، بەلاّم خانەکانی دیکە، کاروانچی‌و میوانی غەریبی تێدا دادەبەزن‌و بۆ ولاّغەکانیشیان ئاخور بەستراوە. لەناو شاری سلێمانیدا (٢٥ـ ٣٠) مزگەوتی گەورە هەیە لەمزگەوتەکاندا ئاوو باخچە هەیە، لەهەر مزگەوتێکدا نزیکەی (١٢٠) کەس نوێژ دەکات، زۆربەی ناو مزگەوتەکانی، بەحەسیر ڕاخراون لەهەر یەکێکیاندا بۆ مەلاو فەقێ (٢ـ٣) ژوور تەرخان کراوە، مزگەوتی گەورە کە حەزرەتی (کاك ئەحمەدی شێخ) تێیدا نێژراوە، نوێژی جومعەی تێدا دەکرێ‌و نزیکەی هەزارو پێنج سەد

کەسێك دەگرێ، حەفیدی ئەوزاتە، ئێستا حەزرەتی (شێخ سەید ئەفەندی)یەو چەند مامۆستاو مودریسی باشی تێدایە، هەموو ژوورەکان پڕ فەرش کراون‌و نزیکەی دە ژووریش بۆ فەقێ‌و دەورویش تەرخان کراون. ئەم مزگەوتە گەوریە (٥ ـ ٦) دەرگای گەورەی هەیەو دوو حەوزی ئاوی تێدایە، لەنوێژی جومعەدا، ناو مزگەوتەکەو دەرەوە پڕ دەبن‌و دوای نوێژ هەر کەسە دەگەڕێتەوە سەر کارو کاسبی خۆی، زۆرجار لەناو مزگەوتدا کۆڕی زیکرکردن دادەبەسترێت لەو لاشەوە دەبینێت ئەڵقە ئەڵقە خەڵك دانیشتوون قسەی خۆش بۆ یەکتر دەگێڕنەوە، ئەم نومایشانە دڵی مرۆڤ دەکاتەوەو چاوی لێ تێر نابێت‌و مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە برایەتییەکی ڕاستەقینە دڵی ئەم خەڵکەی پێکەوە گرێ داوە، بەشێوەیەکی گشتی، مزگەوتەکانی سلێمانی فراوان‌و دڵ کراوەن.

دە دانە گەرماو، لەناو شاردا هەیە، هەر کەسێك بچێتە گەرماو دەبێت خاولی ـ ی خۆی لەگەڵ بێت ـ هەر گەرماوێك حەوزێکی تێدایە، بەڵام کارگێڕەکانیان پاك‌و تەمیزنین‌و وەك گەرماوەکانی مووصڵ‌و حەڵەب نابن. لەناو هەر گەرماوێکدا حەوزێکی گەورە هەیە کە دەرگاکەی کراوەیە. شافعی مەزهەبەکان بۆ غوسڵ دەرکردن خۆیان تێ فڕێ دەدەن، بۆ گەنێك لەناو ئەو حەوزانەوە دێتە دەرەوە، بۆ حەنەفییەکانیش حەوزی تایبەتی جیاکراوەتەوە کە پیاوە گەورەکانی ناوشار غوسڵی تێدا دەردەکەن (٧).

## دەنگوباسی ناوشار

لەمێژە ناکۆکی کەوتووەتە نێوان شێخان و هەمەوەندەکانەوە لەنێوان (١٠)ی مایس ـ ەوە تا ٢٣ی مایس) ئەم دەنگوباسانە لەناو شاردا دەبیسرێن.

هەمەوەندەکان، لەم رۆژانەدا (شێخ نەجمەددینی سەید نووری زادە)یان شەهید کرد، بۆ تۆڵە سەندنەوە (شێخ مەحموودی شێخ سەعید)و (شێخ سەعیدی گوێك تەپە) (٩)و چەند ساداتێکی دیکە لەگەڵ دوو هۆزی (تەرخانی و رۆغزایی) (١٠) کۆبوونەوەیەکی گەورەیان کردووە تاوەکو بدەن بەسەر هەمەندەکان و تۆڵەیان لێ بسێننەوە. ئەم جۆرە شەڕو شۆڕانە جار بەجار بەشێوەیەکی دڕندانە گڕ دەستێنێ شتی وا بەیەك دەکەن مەگەر دێوو درنج بە یەکیان کردبێت.

ئەم لەشکرە تۆڵەسێنە، لەئاوایی (داری کەلی) (٧٠٠ ـ ٨٠٠) سوارەو پیادەیان ئامادەکرد، وەك بیستمەوە پێشڕەویی ئەم لەشکرە گەورەیە، پڕیان کردە سەر هەمەوەندەکان، بیست سی سوارەی هەمەوەندیان لێ دەرپەڕی تاروماریان کردن و دە پانزدە کەسیشیان لێ بەدیل گرتن، دیلەکانیانن چەك کردن و ئەسپەکانیان لێ وەرگرتن ئینجا بەرەڵایان کردن، ئەم رەوشتەی هەمەوەند مایەی سەرسوڕمانە و شیاوی نووسینە.

ژمارەی کوژراوو بریندارى هەمەوەندەکان نەزانراوە، بەڵام لەچاو هێرش بەراندا زۆر کەم بووە. ئەم تێکشکانە خوێنی شێخانی هێنایەوە جۆش، ئەمجارە لەشکرێکی زۆر گەورەتریان لەهۆزەکانی جاف، پشدەر، باجەلان، شوان، جەباری بە (١٥٠٠ ـ ٢٠٠٠) چەکدارەوە ئامادەکرد، هەمەوەندەکان کە ئەم دەنگوباسانەیان پێ گەیشت لەترساندا، ئاواییەکانی ناو (بازیان)یان چۆڵ کردو بەرەو نزیك

شاری کەرکووك ڕەویان کـرد، هێرشـبەران کەهاتنـە سـەر ئاواییـەکانی هەمەوەنـد هەرچـی تێـدابوو تالآنیـان کـردو دەغـڵو دانیـان سـووتاندنو بەسـەرکەوتنەوە گەڕانەوە دواوە (١١).

تێبینی ـ نووسەری ئەم سکالآنامەیە، نە ناوی خۆی نووسیوە نە وەزیفەکەشی دەستنیشان کردووە وا دیارە فەرمانبەرێکی عوسمانی ـ ی بە ڕەگەز کورد بووە.

## بەڵگەی ژمارە (٢)

ئـەو پـرسو لێکۆڵینەوەیـەی (١٢) کـە لەلایـەن والی مووصڵ (ڕەشـید پاشـا)و پارێزگاری کەرکووك (حەسیب بەگ)ەوە کراوە:

بـەهۆی بلاوکردنـەوەی (قـانوونی ئەساسـی)و داوا کـردن لـە (ئەنـدامانی پەرلـەمان) (١٣) بـۆ کۆبوونـەوە داوا لەجـەماوەری سـلێمانی کـرا لـەگۆڕەپانی بەردەمی سەرا کۆبوونەوەیەك سازبکرێ بۆ ئەوەی فـەرمانی سـەڵتەنەتی بـۆ ئـەم مەبەستە بخوێندرێتەوە دەربارەی کۆبوونەوەی پەرلەمان.

بۆ ئەم کۆبوونەوەیە، هەرچی زاناو پیـاوە نـاودارو شـێخەکانە بـانگ کرابـوون لەبەرەی شێخان سەعیدی حەفیدو کوڕی براو خزمەکانیشی داواکرابوون.

ڕۆژەکەش ڕێکەوتی ڕۆژی چوونە سەرتەختی (١٤) پادشا بوو لەو گۆڕەپانەش، فەرمانبەران بە سوپاییو مەدەنییـەوە ئامـادە بـوو بـوون، ڕۆژی سـوێند خـواردن بـوو بـۆ نـوێ کردنـەوەی متمانـە بەتـەختی پادشاهێتی، دەبـێ سـوێندەکەش بـۆ پەیڕەوکردنی یاساو جێبەجێ کردنیو لانەدان بوو لەفەرمایشتەکانی سوڵتان.

لەپیاوە ناودارەکانی میری، فەرماندەی پێشووی سوپا میرلیوا (مـستەفا پاشـا)و سەرلەشـکری ئێـستا (قـۆڵ ئاغاسـی سـاڵح ئاغـا) حـازر بـوون. هـەروەها سـەرۆکی دادگای جەزا (ئەحمەد رەفعەت)و دوکتۆر (چیا)و ئەفسەری تەجنیـدی سەرچـنار (حاجی عەبدوڵلا ئەفەندی)ی سەر نووسەرو مەئمووری ئیجـرا (نـەجیب)و سـەر

نووسەری دادگا (دەروێش)یش حازر بوو بوون، زۆربەی ئەم ناودارانە، کینەو ناحەزییان لەگەڵ بەرەی شێخاندا هەبوو، لەناو خۆشیاندا ڕێکەوتنێکی نهێنییان بەستبوو بۆ هێنانەدیی مەبەستەکانیان هەروەها پێوەندییان لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کردبوو کە ناحەزی کۆنیان لەگەڵ شێخاندا هەیە، هاتن هەموویان لەڕیزی کۆمەڵەی (ئیتحادو تەرەقی)دا ڕێك خستو دەستیان کردە شکات کردن دژی شێخانو لەڕۆژنامەکانی بەغدادو موصلْ کە شتیان لەم بارەیەوە بڵاودەکردەوە، ئەوەبوو پاش ڕەمەزان، بە چەند ڕۆژێك لەکوڕانی مەرحووم (شێخ سەعید شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدو سەید ئەحمەدی بابا رەسوولو شێخ صاڵحی مفتی زادە) بانگ کرانو تەوقیف کران، ئەوەندەی پێ نەچوو پڕ ئەو ناوە لەسەر بازکراو دەیان کەسیان لەبازاڕییەکان بانگ کردو بردیاننە پۆستەخانەو تەلغورافیان بۆ مووصڵو بەغداو ئەستەمبووڵ پێی نووسی (١٥)، بۆ زیاتر ورژاندنەوەی جەماوەر دکتۆر (ضیاء)و (ساڵحی قوڵ ئاغاسی)و (فەهمی یوزباشی) (١٦) چوونە ناو بازاڕو لەناو خەڵدا بڵاویان کردەوە کە شیخان بۆیە تەوقیف کراون، چونکە قەرداری میرین، ئێوەیش هەستن ڕاپەڕن، هەرچی کەسێك لەئێوە نەچێتە بەر دەرگای سەراو دژی شێخان نەوەستێت، سزای دەخرێتە سەرو تەوقیف دەکرێت، بەم درۆو دەلەسەیە خەڵکێکی زۆریان کۆکردەوە، هەر لەم هەلو مەرجەشدا پێوەندییان بە مووصڵەوە کرد بۆ ئەوەی شێخان سەوق بکرێنە مەرکەزی ولایەت لەمووصڵ.

دوای گرتنی شێخان، کاربەدەستان سەربازی چەکداریان دەنارده سەر ماڵی شێخان، قسەی ناشیرینیان ئاراستەی ئافرەتانیان دەکردو دەیان ترساندن. لەولایشەوە، تەنگیان لەفەرمانبەرە بێ لایەنەکان هەڵچنی، وەك سەرنوسەری دایەرەی ئەملاك (توفیق ئەفەندی)و سەرنووسەری کاروباری ڕۆژانە (قادر ئەفەندی)و هەموو فەرمانبەرە بێ لایەنەکانی دیکە.

ئەم دەست درێژی کردنانەیان بوو بەهۆی ئەوەی ئارامی لەناو شاردا نەمێنێت‌و دەست درێژی کرایەسەر سەربەستیی زۆرکەس‌و شیرازەی ئیدارەی ئیتحادو تەرەققی پچڕا. خوا ئەو کەسانە بگرێ کە بوونە هۆی ئەم ناهەموارییە، ئامین.

## بەڵگەی ژمارە (٣)

ئەو سکالآنامەیەی کە لە(٢٠ی نیسانی ١٣٢٥) درایە نووسینگەی ویلایەتی مووصل:

دوای ئەوەی کە والی ـ ی نوێ (١٧) گەیشتە ئەو شارە، شەو تەقە ئارامی لەخەڵك هەلگرت، هەمەوەندەکانیش لەدەوروپشتی شار خەریکی چەتەگەری بوون. هەندێ لەفەرمانبەرە توندڕەوەکان دروستی کارەکەیان ئاوەژۆ پێ کرد، ئۆباڵیان خستە سەر بەرەی شێخان، من کە ئەمە پێنج ساڵە لەسلێمانیدا فەرمانبەرم (١٨)، دەڵێم چەند کەسێك نەبێت دانیشتوانی شار هیچ گوناهێکیان نییە. ئەو چەند کەسانە ئەو دوو بەرەکییەیان ناوەتەوەو درۆو دەلەسە بلآودەکەنەوە.

یەکێك لەو پیلانانەی کە لەم بارەیەوە هۆنرابووەوە ئەوە بوو کە لەڕۆژنامەی (بغداد) بەناونیشانی (کارەساتەکەی سلێمانی)یەوە بلآوکرایەوە، نووسیبووی: (لەسلێمانی، لەکوردستانی باشوور، شتی ناڕەوا ڕوویداوەو دەستدرێژی کراوە) نەحکومەت‌و نە کەسێك وەلآمی ئەوشتە درۆو دەلەسانەیان نەداوەتەوەو هەروەها لەڕۆژنامەی (مووصڵ)یش شتی نابەجێ دژی شێخان‌و سلێمانی بلآوکرایەوە بۆ ئەمەش وەلآمێك نەبوو.

داواکارم خودا دەوڵەت بپارێزێت‌و پادشامانیش پایەداربێت.

پەراوێز بەم چەشنە، دوا بەدوای ئەو سکالآنامانەکان، بەم شێوەیە نووسراوە:

خەڵکی لەناو خۆیاندا لەیەکتر دەپرسن، ئەمە پێنج ساڵە هەڵبـژاردن نـەکراوە بـۆ ئەنجوومـەنی شـارەوانیو ئیـدارە (١٩)، هـەروەها ئەنـدامانی نـوێ بـۆ دادگـا دانەنراوە؟ بەپێی یاسا دەبێت هەردوو سـاڵ جارێـك هەڵبـژاردن بکـرێ، مانـەوەی کەسانێك ئەوەندە ساڵ لەجێی خۆیان مایەی سەرسوڕمانە.

دە ڕۆژێـك لەمـەوپێش (ئـەمین ئەفەنـدی)ی نوسـەر لەدایـەرەی مەصـرەف ڕەوانەی (گوڵعەنبەر) (٢٠) کراو لەو سەرەوە کە گەڕایەوە قائیممـەقامی پێـشووی گوڵعەنبـەر، (عوسمـان پاشـا)ی لەگـەڵ خـۆی هێنایـە سـلێمانی، لـەبارەی ئـەم داواکردنەی پاشا، قسەڵۆکە زۆرە، هەندێك دەڵـێن (عوسمـان پاشـا) (٢١) دەبێتـەوە قائیممەقام یان دەڵێن بۆ ئەوەیـە کـە دەست نەخاتـە نـاو کاروبـاری ژمـارەکردنی مەڕومالآت یان دەڵێن ڕێك کەوتنێکی نهێنی لەئارادایە، هەروەها دەڵـێن سـەرۆکی جاف، (مەحموود پاشا)یش داواکراوە لەمـە زیـاتر دەنگوباسـێکی ئـەوتۆ نییـە کـە شیاوی باس کردنەوە بێت.

## بەڵگەی ژمارە (٤) وێنەی وەڵامدانەوە (٢٢):

مایەی بەختیارییە بۆ چاپەمەنییەکانمان، کەشتی بەسوود بڵاوبکەنەوە کە سەرکەوتنی گەل‌و وڵاتی لێ بەدی بکرێ، جووڵانەوە بە پێچەوانەی ئەمە، مایەی ناخۆشی‌و شەرمەزارییە.

خوێنەران دەزانن کە چەند مانگێك لەمەوپێش لەشاری بەغدای مەرکەزی ویلایەت، چەند ڕۆژنامەیەك وەك ڕۆژنامەی (بەغدا) (٢٣) شتی ئەوتۆی بڵاوکردەوە کە لەگەڵ ڕێڕەوەی ڕۆژنامەنووسی ناوەشێتەوەو لەسەر بناغەیەکی ڕاستی نەوەستاوە بەتایبەتی ئەو نووسینەی کە لەژمارە (٢٤)ی ڕۆژی (١٨ی مایسی ساڵی ١٣٢٥)دا بە ناونیشانی (کاروباری کوردستانی باشوور- کارەساتەکەی سلێمانی) کە لەدرۆو دەلەسە بەو لاوە هیچ ڕاستییەکی تێداهەست پێ ناکرێ، لەوەڵامدانەوەی ئەو نووسینەدا، دەڵێم: پێڕەوی ڕێبازی ئیرشاد لەزنجیرەی خاوێنی هاشمی زانای بەناوبانگی جیهانی ئیسلامی (شێخ سەعید ئەفەندیی حەفید) سەرمەشقی دادپەروەری‌و خاوەن خووڕەوشتی بەرز، ئەو ناکەسانە هاتن بەرامبەر ئەم زاتە دەستیان دایە درۆو دەلەسە هەڵڕشتن دوای لەناوبردنی لەزمان درێژی بەرامبەر کەسوکاری نەوەستان، کردەوەی ئەو کەسانە کاری کردە سەر هۆزو بنەماڵە کوردەکان‌و زۆریان پێ ناخۆش بوو گەلێك دلگیربوون. بنەماڵەی شێخان هەمیشە هەق پەروەر بوون‌و ئەو باج‌و خەراجاتەی لێیان داواکراوە لەوەختی خۆیدا داویانەو لەخراپەکارییەوە دوور بوون، بەدرۆخستنەوەی ئەم ڕۆژنامەیە، کارێکی پێویستەو بەدڵی خەڵکی ئەم شارەیە ڕۆژنامەی (مووصڵ) کە لەمەرکەزی ویلایەت دەردەچێت‌و کاروباری ناوچە باشتر دەزانێت‌و لەڕووداوەکانەوە نزیکترە نووسینێکی بەناونیشانی (کاروباری کوردستانی باشوور، باری دروستی کارەساتەکەی سلێمانی)یەوە بڵاوکردووەتەوە

دەڵێت: لەناو دۆستو دوژمندا ئاشکرایە کەسەیدەکانی بەرزنجە لەنەوەی پاکی پێغەمبەرنو خاوەن خوورەوشتێکی بڵندن لەناو ئەم زنجیرەیە (کاك ئەحمەدی شێخ)ی خوالێخۆشبوو پایەیەکی پیرۆزی لەناو خەڵکدا هەبووەو نموونەیەکی تاقانە بووە لەخاکی عیراقو ئێران، بەمورشیدی ئەکمەل دانراوەو گەوهەرێکی یەکانە بووە، بەمە، دڵی سوڵتانەکانی عوسمانی، خەلیفەی موسڵمانانی ڕاکێشاوەتە لای خۆی، دوای ئەو زاتەش شەهید (شێخ سەعیدی حەفید زادە) هەمان پایەی وەرگرتووە تاوەکو چەند جارێك بۆ ئەستەمبووڵ (٢٤) دەعوەت کراوەو لەلایەن خەلیفەکانەوە ڕێزی گیراوە، زمان درێژی بەرامبەر ئەم بنەماڵەیە نموونەی ناهەقیو بەدرەوشتییە (شێخ سەعید)ی رەحمەتی هەمیشە بۆ وڵاتو نیشمان دوعای خەیری کردووە، هۆی ناهەمواری باری ئاسایش لەکوردستانی باشووردا دەگەڕێتەوە سەر ئەم بنەمایانە:

فەرمانبەرانی میری بۆ سوودی تایبەتی خۆیان باری ئیدارییان شێواندووە، نوسخەی دووەمی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەلایەن ئەو فەرمانبەرانەوە نووسراون، ئەوە پیشان دەدەن کە ڕاپۆرتی نهێنی پڕ (٢٥) درۆو دەلەسە بۆ سوودی تایبەتی خۆیان نووسیوە، وەك سیخوڕێك دژی ئەمو ئەو بۆ کوشتنو برین، پیاو کوشتن، کاروان ڕووتەوە کردن، تا بگاتە پارێزگار داپلۆسینیان کردووەتە پیشەی خۆیانو قسەی ناشیرینیان بە قوماندانەکانیش کردووە، شەوان تەقەیان لەدایەرەکان کردووەو کەچی ئەم هەموو کارە ناپەسەندانەیان داوەتە پاڵ (شێخ سەعید ئەفەندی)، ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە (٢٦).

ئەو درۆو دەلەسانەی کە خاوەن نووسینەکە لەڕۆژنامەی (بەغدا) بڵاوی کردبووەوو مایەی سەروسووڕمانە، ناتوانم هیچی ئەوتۆی لەبارەوە بڵێم، لەوە زیاتر کە ئەو نووسینانە لەدرۆو دەلەسە بەو لاوە هیچی تر نییەو لەلایەن چەند کەسێکی بێ ویجدانەوە هۆنراوەتەوە، شاری سلێمانی لەماوەی ئەم دە پانزدە

ساڵەی دواییەدا، زۆر ناڕەحەتیی چێشتووە، لەمەدا شێخ هیچ سووچو قەباحەتێکی نەبووەو هەمووشی دەکەوێتە ئەستۆی ئەم تاقمە بێ ویجدانو درۆزنانەوە.

بەمانەشەوە نەوەستان، هاتوون تۆمەتی ناڕەوایان داوەتە پاڵ شێخانو ڕاپۆرتی نهێنییان بۆ ویلایەت نووسیوە، بۆ ئەوەی باری ئاسایش لەسلێمانیدا بشێوێنن، بەڵێ (شێخ سەعید) سەر بەئیدارەی پێشوو بووە، بەڵام زاتێکی ئاسایش پەروەر بووە، هەندێ کەس بۆ سوودی تایبەتی خۆیان ڕاپۆرتی درۆیان دژی جەنابی شێخ نووسیوە، (شێخ سەعید) لەخووڕەوشتو بیروڕادا لەگەڵ کاربەدەستانی پێشوودا نەبووە، بەڵکو ئەگەر زوڵمو زۆرێکیان بکردبایە دژیان دەوستاو لێی قبووڵ نەکردن.

## دواجاڕدانی مەشرووتییەت

دوای هەرەس هێنانی سەڵتەنەتی عەبدولحەمیدو جاڕدانی مەشرووتییەتو بلاوبوونەوەی یاسای ئەساسی بۆ روونکردنەوەی ئە یاسایەو بیروڕای مەشرووتییەت پێوەندی کرا بەناوادارەکانی سلێمانییەوە لەپێشدا پێوەندی کرا لەگەڵ (حەزرەتی شێخ سەعید) ئەفەندی تاوەکو لەبۆچوونەکانی سوود وەربگیرێ، کەچی قوماندانی پێشووی سلێمانی لەگەڵ تاقمێك لەهاوبیروڕاکانیدا بەمەبەستی پەرتکردنی ڕیزی دانیشتووان ـ ئەم پارێزگایەی سلێمانی ـ یە کە کەوتووەتە گۆشەیەکی سنووری دەوڵەتەوە ـ ئەم قوماندانە پشتی لەشێخ کردو پێوەندی لەگەڵ ئەو کەسو هۆزانەداکرد کە ساردییەکیان لەگەڵ بەرەی شێخاندا هەیە وەك مەحمود پاشای جاف کە یەکێکە لەسەرکردە بەناوبانگەکانی هۆزی گەورەی جافو ئەو دوایی لەناحەزانی بەرەی شێخان.

چۆنێتی دورخستنەوەی شێخ سەعیدو هاوڕێکانی لەسلێمانی

کە ئینقلاب (٢٨) بەرپابوو لەهەندێ شارو شارۆچکەدا ڕاپەڕینو ڕێڕەو (٢٩) دەستی پێکرد، لەسلێمانیشدا قوماندانی سوپاو هاوبیروڕاکانی لەدوژمنانی شێخان بۆ دووبەرەکی نانەوە دەستیان کردە هەندێ جموجۆڵی دوژمنانەو نرخی ئاسایشو ئاسوودەگیو یەکسانی لەناو شاردا هەڵگیرا لەجیاتی ئەوەی شاییو خۆشی بکرێ بناغەیان بۆ کارەساتێکی دڵتەزێن دارژاند، ئەوانەی کە دەستیان لەئاژاوە گێڕیدا هەبوو خۆیان لەناو کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەققیدا مەلاسدەداو شێخانیان بە ستەمکارو چەوسێنەرو خوێنڕێژ دابووە قەڵەمو جەماوەریان هاندەدا کە دژی شێخان ڕاپەڕن. ئەوانەی کە لەم دووبەرەکییەدا بێلایەن وەستابوون تۆمەتو تانووتیان ئاراستە دەکرا بەم شێوەیە لەهەموو هەلومەرجێك، لەکووچەو بازاڕدا دەستیان دایە دەمدرێژی دژی شێخانو لەڕۆژە

ڕەسمییەکانیشدا ڕێزیان نەدەگرتن، تاودکو ڕوژنێك ناردیان لەکوڕانی (شێخ سەعید)، (شێخ مەحمود)و (شێخ ئەحمەد)و لەحزمەکانیشیان، (سەید ئەحمەدی بابا ڕەسوڵ)و (شێخ صالح ئەفەندیی موفتی)یان بەبانووی قەرداریی‌یەوە بانگ کردو تەوقیفیان کردن‌و کتوپڕ دکتۆر ضیاء (٣٠) و چەند کەسێکیان چەند چەکدارێکیان لەگەڵ خۆیان هەلگرت‌و چوونە ناوبازاڕو بەکاسبکارەکانیان ڕاگەیاند زوو بچنە بەر دەرکی سەرا، لەوێ فەرمانی سوڵتانی دەخوێندرێتەوە، ئەوی نەچێت تووشی سزا ئەبێت.

بەزۆری زۆردارەکی دووکانەکانیان پێ دادەخستن، لەو لاشەوە بەهاوپەیمانەکانی خۆیان دەگوت واحکومەت شێخانیان حەپس کردووە ئێوە هەستن، ڕاپەڕن، بەم شێوەیە حەشاماتێکی زۆر لەبەردەرکی سەرای حکومەت گلێربوونەوە، هەندێکیان تەماشاکەر بوون، دوای سێ ڕۆژ جەماوەر کۆکردنەوە، بەشێوەیەکی ناشرین (شێخ سەعید)و (شێخ مەعروف)ی برای‌و ئەو دوایی شێخەکانیان ڕەوانەی (مووصڵ) کرد (٣١).

دوای ڕەوانەکردنی شێخان چی ڕووی دا؟

دوای ڕەوانەکردنی شێخان‌و دوورخستنەوەیان، دوژمنەکانیان نامەردانە جەندرمەو چەکداریان دەناردە سەر ئافرەت‌و ماڵ‌و منداڵەکانیان‌و قسەو قسەلۆکیان تێدەگرتن، لەسەرەنجامی ئەم کردەوە ناپەسەندانەدا (ژنی شێخ ئەحمەدی برای شێخ سەعید) لەترساندا منداڵی لەبارچوو، جارێکیان ژن برای شێخ ئەحمەد نەخۆش بوو، لەماڵەوە کەوتبوو، چوونە سەری‌و لەنوێنەکەی هێنایە دەرێ‌و دایان بەکۆڵ سەربازێکداو کووچەو کۆڵانەکانی سلێمانییان پێ گێڕا، ئینجا برایە سەرای حکومەت، ئەم جۆرە کردەوانە بەسەر ئەو بەسزمانانەدا کارێکی زۆری کردە سەر دڵ‌و دەروونی خەڵك، کە ئەمە لەخۆیدا هیچ پەیوەندییەکی بەڕێڕەوی مەشرووتیەتەوە نەبوو بوو دژی یاسا بوو،

لەوکاتەشدا بۆ چاوبەست بلاوکرایەوە کە لەم ڕۆژانەدا شێخان دەگەڕێنەوە دواوە ئەوەبوو پاش دوورخستنەوەیان بە پانزدە ڕۆژێك لەپڕێکدا بەهۆیەکی نەزانراو (٣٢) کارەساتە دڵ تەزێنەکەی مووصڵ بەرپا بوو، حەزرەتی (شێخ سەعید)و (شێخ ئەحمەد)ی کوڕیو (٣٠) کەس زیاتر بەشێوەیەکی دڕندانە شەهید کرانو بایی پێنج شەش ملیۆن لیرەماڵو حاڵیشیان تالانکرا، خاوەن مەقالە ئۆباڵی ئەوکارەساتە دەخاتە سەر یەکێك لەکوڕەکانی (شێخ سەعید) گوایە قسەی بۆ ئافرەتێکی مووصڵاوی فڕێداوە دوایی دەرکەوت کە بەرەی شێخان هیچ پەیوەندیەکیان بەرووداوی یەکەم ڕۆژی جەژنەوە نەبوو، پاش لێکۆڵینەوە بەبەڵگەوە دەرکەوتووە ئەو کاروبارانەی لەسلێمانیش رووی دابوو هەمووی دەستکردی ئەندامانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بووەو شێخان لەبەرپاکردنیدا هیچ سووچو قەباحەتێکیان نەبووە. لەوانەی لەوکارەساتەی مووصڵ بەهەزار حاڵ رزگار بووبوو لەکوڕانی (شێخ سەعید شێخ مەحموود)و (شێخ مەعروف)ی برایو (سەید ئەحمەدی بابا رەسووڵ) بوو، ئەو زاتانە کە گەڕانەوە ئامۆژگاریی ئەو هۆزە هەڵچوانەیان کرد کە دان بەخۆیاندا بگرنو چاوەڕێی ئەوە بکەن تا حکوومەت لەکارەساتەکە دەکۆڵێتەوەو سزای تاوانباران دەدات.

جەنابی (شێخ عەبدولقادری شەمزینی)ی سەرۆکی کۆمەڵی کورد لە ئەستەمبووڵ (٣٣)و ئەندامی کۆمەڵەکەیان هەستیان بە سەرەنجامی ئەم گیروگرفتە کردو دەستیان کردە تێکۆشان بۆ ڕوونکردنەوەی هۆو سەرەنجامی ئەم کارەساتە تا حکومەت بکەوێتە لێکۆڵینەوە نەوەك دووبەرەکی بکەوێتە ڕیزی مووسوڵمانانەوەو ئامانجی کۆمەڵەکەشیان میللەت پەروەری بوو. هەندێ لەڕۆژنامەکانی بەرەی ئیتیحادو تەرەقی کەوتنە دەمدرێژی دژی ئەم کۆمەڵەیە، بەلام کۆمەڵ گوێی نەدایە نووسینی ئەم جۆرە کەسانەو لەسەر هەوڵو تێکۆشانی خۆیان سووربوونو سەرنجی کاربەدەستانی میرییان بۆ ئەوە ڕادەکێشا کە بەوردی

بڕواننە ئەحواڵى كوردستانى باشوور ئەوساكە شت بلاوبكەنەوە، هەوڵى دەدا ئەو قەڵەم بەدەستانە ئیقناع بكات كە ئەم كارەساتە لەبنەڕەتدا لەسەر بناغەى درۆو دەلەسە داڕێژراوەو مەبەستى كۆمەڵەش دەربڕینى راستییە لەپێناوى خۆشویستنى میللەتو نیشتمان. بەم شێوەیە كۆمەڵە توانى كاربكاتە بەشێكى زۆر لەئەندامانى ئەنجوومەنى مەبعووسانو بارى درووستى كارەساتەكەیان بۆ روون بكاتەوە،كاتێك ئەو گێرەشێوێنانە هەستیان بەوەكرد كە لەمكارە ناڕەوایەدا خەریكە مایە پووچ دەربچن هاتن كارەساتى مووصڵیان بەرپاكردو لەئەستەمبووڵیش، هەوڵیاندەدا حكوومەت ئەوەندە بایەخ بە رووداوەكەى موصڵ نەدات.

سەرئەنجام، ئەندامانى ئەنجوومەنى مەبعوسان، (شێخ سەعید)یان بەپیرۆزترین شەهید لەشەهیدەكانى ئەو سەردەمە دایە قەڵەم، ئەم بڕیارەیان ئاگرى فیتنەو دووبەرەكیى كوژاندەوە، چونكە لەوڕۆژانەدا بەهۆى كارەساتى كوشتنى (شێخ سەعید)ەوە هۆزەكانى كوردى لەهەڵچوونو ڕاپەریندابوون (٣٤)، خەڵكى هاتنە سەر ئەوەى بپرسن ئاخۆ بەپێى بڕیارى چى دادگایەكو بەچى مافێك (شێخ سەعید) ئەم زاتە پیرۆزە لەسەردەمى ئازادىو سەربەستىو مەشرووتیەتدا لەسلێمانى دوورخرایەوە؟!

دواى ماوەیەك، دەست كرا بەپرسو لێكۆڵینەوە هەر كەسێك چى بینیوەو چى دەزانىو وەڵامى دایەوە، گەلێ بەڵگەى نووسراوم بەدەستەوەیە كە نووسەرى ئەوڕۆژنامەیە بەدرۆ دەخاتەوە. ئیتر ئەوە بەسەر چوو هەركەسێ بتوانێت بەدرۆو دەلەسە پیلان بهۆنێتەوە ئەو شتانە لەخەیاڵ بەولاوە هیچى تر نییە خەیاڵیش بۆ كەس ناچێتە سەر.

لەڕۆژانى كارەساتدا، ئەو تۆمەتە خرایە پاڵ حكوومەت كە هیچ هەڵوێستێكى پیشان نەداوەو خاوەن بڕیار نەبووە، (شێخ عەبدولقادر ئەفەندى) داواى

لەحکومەت دەکرد کە دەور بگێڕێ ئەوەبوو لەسەرەنجامی ئەو کۆشش و هەوڵدانە والی مووصڵ و متەسەریفی سلێمانی عەزل کران، بەڵام ئەوانەی دەسدرێژیان کردبووە سەر حاڵ و ماڵی خەڵکی لەوناوە دەسووڕانەوە بەمە ئارامی لەخەڵکی هەڵگیرا، عەشایری دەوروپشتی سلێمانیش کەوتنە جونبووش و چوونە سەرماڵی موتەسەریفی پێشووی سلێمانی و ماڵەکەیان تالانکرد، ئەوەشیان بلاوکردەوە کە (شێخ سەعید گۆیك تەپە) بە هەزار سوارەوە ئابلۆوقەی سلێمانی داوە لەبەر ئەمە سەر لەنوێ چەك دابەشکرایە سەر هەندێك لەدانیشتوانی شارو مەترسی کەوتە ناوەوە مەبەستی بەرەی ئیتیحادو تەرەققی ئەوە بوو شێخە کۆس کەوتووەکان نەگەڕێنەوە شارو دەستەلاتی خۆیان وەرنەگرنەوە.

## والیی نوێ و چەوساندنەوەیەکی نوێ

(عیززەت پاشا) بەوالی نوێی موصڵ دانرا، هەر کە چووە سەر کورسی ویلایەت فەرمانی دەرکرد بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کارەساتەکەی سلێمانی و مووصڵ و فەرمانیدا ئەو کەسانەی کە مانەوەیان لەسلێمانی مەترسی دەبەخشێتە ئاسایشی شار لەوێ نەمێنن، ئینجا خۆی سەفەرێکی بۆ سلێمانی کردوو بێئەوەی بەلایەکدا بتاشێت زۆر بەوردی و هێمنی دەستی دایە پرس و لێکۆڵینەوە. هەر کە والی گەیشتە شار بەرەی شێخان و دوژمنەکانیانی پێکەوە کۆکردنەوەو ئاشتی کردنەوەو لەبەردەم والیدا دەستیان لەمل یەکتر کرد، ئەم هەنگاوەی والی خۆشی و ئاسوودەگی خستە دڵی خەڵکەوە، بەڵام ئەم هەنگاوەی والی بەدڵ گێرە شێوێنەکان نەبوو هەندێکیان خۆیان لەوالی نزیك خستەوەو لەولاشەوە دەستیان دایە مەزبەتەکردن و لەژێریشەوە خەڵکیان دژی یەکتر هاندەدا، جا بزانە ئەم جۆرە خەڵکانە خاوەن چ دڵ و دەروونێکی مردوون، بڕیار لەسەر ئەمە بۆ خوێنەر بەجێ دەهێڵم.

## سلێمانی سەر دانانەوێنێ

بەپێی عەدالەتی یەزدانی لەناو ئادەمیزاددا بەرامبەر بەیەکتری دەبێ ستەمکاری‌و دووڕوویی‌و درۆو دەلەسە نەمێنێت، چ بۆ دانیشتوانی سلێمانی‌و چ بۆ خەلکی کوردستانی باشوور ئاشکرابوو کە پێوەندی دروستی برایەتی لەناو یەکتردا دەبێتە هۆی یەکگرتن‌و سەرکەوتن. ئەوانەی کە گێرە شێوێن‌و خاوەن بیروڕای پووچن لەئاستی تەقەللاو هەوڵ‌و کۆششی ئەندامانی مەجلیسی مەبعوسان کشانەوە دواوەو دەستیان دایەوە نووسینەوە لەڕۆژنامەکاندا، بەلام بەهۆی هەوڵی والیی نوێ‌و بۆ بەرژەوەندی گشتی شێخان‌و خەڵکی دی دووبەرەکی ناو خۆیان چارەسەرکردو ناکۆکی لەئارادا نەماو ئیتر لەمەولا مل بۆ کەس دانانوێنن.

دانیشتوانی شار باوەشیان بۆ یەکتر کردەوەو ئەوانەی شاریان بەجێ هێشتبوو لەگەڕانەوەدابوون، هۆزی جافیش هاتە ناو ئەویەکێتییە نوێیەوە هەموو لایەك زۆر بەهێمنی کاروباری خۆیان جێبەجێ دەکەن...

## بەڵگەی ژمارە (٥)

ئەو نووسینەی کە لە (٢٧ی نیسانی ١٣٢٥)دا ئاراستەی دەفتەری ویلایەتی موسڵ کرا بوو:

بەزمانی کۆیلەیەتیمەوە (٣٥) دوعای چاکە بۆ سەرکەوتنتان دەکەم لەکاغەزی پێشوومدا بۆ بەجێ هێنانی ئەوانەی کە ئێستا عەرزتان دەکەمەوە وا دووبارە ناچارم بیرتانی بخەمەوەو جورئەت بدەمە خۆم‌و سەرتان بهێنمەوە ئێش.

ڕۆژنامەی (الارشاد) کە بینی وا ئاسایش کەوتووەتە ولات‌و مەیدان چۆڵە دەستی دایە درۆو دەلەسە هەڵڕشتن کە کەس باوەڕی پێ ناکات. لەژمارەیەکیدا

بەم ناونیشانە (دیسانەوە سلێمانی، دیسانەوە والیی نوێی موسڵ) مەقالەیەکی بڵاوکردەوە ناوەرۆکەکەی لەڕاستییەوە دوورە، بەندە بەرپەرچی ئەو مەقالەیەم داوەتەوە وا بۆئێوەی بەڕێزی دەنێرم بەڵکو ئەمر بدەنە ئەو رۆژنامەیە بڵاوی بکاتەوە تا باری. بەراستی گیروگرفتەکە وەك رۆژی روناك پرشنگ بداتەوە.

بەرپەرچ دانەوەکە (٣٦): لەرۆژنامەی (الارشاد)ی ژمارە (١٩)ی رۆژی (١٥ نیسانی ١٣٢٥) کە لەبەغداد دەردەچێت بە ناونیشانی (دیسانەوە سلێمانیو دیسانەوە والیی نوێی موسڵ) مەقالەیەکی لەبارەی هەلو مەرجی ئێستای سلێمانی بڵاوکردبووەوە بەداخەوە پڕی بوو لەدرۆو دەلەسە.

ئەم ئازادییەی کە دراوەتە چاپەمەنی ئێمە وامان لێ چاوەڕوان دەکرد کە بۆ بڵاوکردنەوەی کەرەستەی ئەدەبیو هونەریو شتی بە کەڵكو ڕووداوی ڕۆژانەی دروست بەکاربهێنرێت بۆ مەبەستی پێشکەوتنو بەرزبوونەوەی بیروڕای خوو ڕەوشتو وشیارکردنەوەو خۆش سوحبەتی بۆ ئەوەی هاونیشتمانییەکی عوسمانی بتوانێ بە دڵنیایی بژی.

لەم دەورە پیرۆزەی مەشرووتییەت ـ دا وا چاوەڕوان دەکرێ ئەم ئازادییەی کە لەئارادا هەیە بۆ سوودی گشتی بەکاربهێنرێ نەك بۆ چەواشەکردنو لادان لەرێگا وەك ئەو نووسینەی کە رۆژنامەی (الارشاد) لاپەرەکانی پێ رەش کردووەتەوەو پڕە لەدرۆودەلەسەو پیلان رێکخستن کە مایەی ئەسەفە، خاوەن رۆژنامەکە بێ ئەوەی شەرم بکات درۆی وای بڵاوکردووەتەوە روونو ئاشکرایە کە لەراستییەوە زۆر دوورە نووسیویتی گوایە نووسینەکانی پێشووی لەلایەن خوێنەرانی سلێمانییەوە زۆر بە تاسەوە خوێنراوەتەوە، نووسینێك کە پڕ بێت لەشتی پڕوپووچو درۆودەلەسە مەگەر لەلایەن ئەو کەسانەی لەو ئاستەدا بێت خوێندرابێتەوە ئەوانەی خاوەن ویجدانێکی خاوێنن نەفرتیان لێ کردووەو بە چاوێکی سووکەوە تێیان ڕوانیووە، ئامانجی ئەو کابرایە لەنووسینەکانی تێکدانو

سەر لێ شێواندنە، لەم بارەیەوە دەمەوێ بەم دوو سێ قسەیە سەرنجی خوێنەران ڕابکێشم.

خاوەن مەقالە لەژێر سێبەری دووری مەشرووتییەت داوا دەکات پیاوانی سەر بە دەوری ئیستیبداد (٣٧) لەناوببرێن، بەڵێ ئەمە وتەیەکی بەجێیەو ئامانجی هەر کەسێکی خاوەن بیروباوەڕێکی مەشرووتییەت خوازە، ئێمە لێرەدا لەخاوەن ئەو نووسینە دەپرسین بەپێی چ ماددەیەکی یاسای ئەساسیو بە گوێرەی حوکمی چی دادگایەك سادات لەشارەکەی خۆیان دەرکرانو دوورخرانەوە؟ ئەمە مایەی سەر سوڕمانە؟ یان نەء..؟

لەناو بازاڕادا دەگەڕانو بەخەڵکەکانیان دەوت (خێرا دەرگای دوکانەکانتان دابخەنو بچنە بەر دەرگای سەرا لەوێ فەرمانی سەڵتەنەتتان بۆ دەخوێنرێتەوە)و کەوتنە ناو خەڵكو بە زۆری زۆرداری دەرگای دوکانو بازاڕیان پێ داخستنو دایانن لەبەرو بردیانن بۆ ئەو کۆبوونەوەی کە لەراستیدا هەڵچوونێك بوو دژی ساداتو پڕ بەدەم لەوێ دەیانوت (ئەگەر سادات نەکوژرێن شتێکی خراپ ڕوودەدات) بەپێی بۆچوونی خاوەن مەقالە ئەم داواکردنە لەئامانجەکانی بەردەمی مەشرووتییەتە؟ ئایا ئەمە بەپێی ئەم ئازادییە کە لەماددەکانی (٩، ١٠)ی یاسای ئەساسیدا هەیە..؟ کە وەهابێت بەپێی قسەی خاوەن مەقالە والی موسڵ بە پێچەوانەی یاسای ئەساسیو مەشرووتییەتو عەدالەتەوە جووڵاوەتەوەو بەناو حکومەتەوە تاوانو گوناهێکی گەورەی بەرپا کردووە بۆ ئەمە نابێت بەرپەچی بدرێتەوەو حیسابی لەگەڵ بکرێ؟

خاوەن مەقالەی ئیرشاد هەوڵی داوە گرتنو دوورخستنەوەی سەیدەکان بەبێ هۆو حوکمێك وا پیشان بدات کە لەسەرەنجامی هەڵچوونێکەوە رووی داوە لەوەدا هاونیشتمانییەکانیش تێکەڵیان کردووە تووش هاتوون لەمەشدا ساداتو بەرامبەرەکانیشیان بە گوناهبار داناوە، بەمە هەوڵی داوە ئاگری دووبەرەکی

لەناو خەڵکدا خۆش بکاتو کلێەی پێ بسێنێ هەروەها هەوڵی داوە ئەو خەڵکە بەوە قایل بکات کە ئەو بەڵگەیە دروستکراوەیە، بزانن ئەم کابرایە چی لێکدانەوەیەکی پووچی کرجووەو چ خەیاڵێکی پیسی لەمێشکدا دەسووڕێتەوە.

وشترێك چووەتە ناو باخێکەوە قەپی لەتەڕو وشکداوە کە باخەوان دەرکەوتووە لەترسانا چاوی خۆی قووچاندووە تاوەکو باخەوان نەیبینێ، حەزرەتی (والی پاشا) کە دەستی کردووە بەلێکۆڵینەوە چاوی بە بەڵگەنامەیەك کەوتووە کە تێیدا چۆنێتیی دابەشکردنی هەزارو پێنج سەد لیرەی بینیوە لەگەڵ ناوی ئەو کەسانەی کە ئەوپارەیەیان بەسەردا دابەش کراوە لەگەڵ بەشی هەریەکێکیانو لەخوارەوەشیدا ئەم رستەیە نووسراوە (ئەم پارەیە بۆ ئەوە دانراوە کە لەموسڵ بۆ هەندێ شتی گرنگ سەرف بکرێ ئەگەر نەکرا بگەرێتەوە بۆ ئەو کەسانەی ناویان لەسەرەوە نووسراوە، من بۆ ئەم مەبەستە ئەم پارەیەم وەرگرت) لەخوارەوەشیدا مۆری ( متصرف لیوا محمد توفیق) هەیەو بۆ راست بوونی ئەم سەنەدە تەحقیقو لیکۆڵینەوەیەکی وردکراوەو خەتەکەشی هی کەسێکە کە دژی شێخانەو مۆرەکەش مۆری موتەسەرریفی پێشووی لیوایەو وێنەی ئەم بەڵگەنامەیە هەڵگیراوە.

ئەم سەنەدە دوای هاتنی والی بۆ سلێمانی بە چەند رۆژێك خراوەتە پێش چاوو لەکەرکوك، کەچی خاوەن مەقالە بە چاوێکی خێڵو خوارەوە روانیوێتییە گیروگرفتەکەو ویستوویەتی چەوتو چێلی بکات.

حەزرەتی والی لەو پرسو لێکۆڵینەوەیەی لەبارەی ئەم گیروگرفتەی کردووە لەهەق لای نەداوەو لەلایەن هەموو خاوەن ویجدانێکەوە پەسەندکراوە ئەگەر تەنیا کەسێك هەبێت ئەم لێکۆڵینەوەی بە دڵ نەبووبێت ئەویش خاوەن مەقالەیە ئێمەش بەم جۆرە وەڵامی بەرپەچدانەوەکەی ئەو دەدەینەوە.

ئـەو کارەسـاتەی کـە لـەرۆژانی جـەژنی قوربـان لەموسـڵ روویـداوە پـاش لێکۆڵینـەوە دەرکـەوتووە، پـێش ئـەوە لەگـەڵ ئەوانـەی کارەسـاتەکەیان هەڵگیرساندووە پێوەندی کراوە، بەڵام خاوەن مەقالە متمانەی بەو بەڵگانە نییـە، ئەو لێکۆڵینەوەیەی لەم دواییەدا لەبارەی کارەساتەکە کـراوە بەڵگەی لەگەڵدایـەو گومانی تێدانییەو دەبێ تاوانباران بەپێی یاسا خۆیان بـدەن بـە دەسـتەوەو پـێ لـەکردەوەکانی خۆیـان بنـێن تـاوەکو سـزاکەیان کـەمترو باریـان سـووکتر بێـتو ئەمـەش ببێتـە دەرسـێك بـۆ ئـەوەی لـەرۆژانی داهـاتوودا لەهەڵـەکان کـەڵك وەرگیرێو کارەساتی تر دووپات نەبێتەوە.

خـاوەن مەقالـە نووسـیویێتی لـەناودارەکانی سـلێمانی سـەرۆکی شـارەوانی (غەفوور)و (حاجی سەعید ئاغا)و (حاجی برایم) ئاغا باریان کردووەتە بەغداد، نـەخێر (غـەفوور ئاغـا) تـاوەکو ئـەمڕۆ لێـرە لەسـلێمانییەو بـۆ هـیچ لایـەك نەڕۆیشتووە، بەڵام (حاجی سەعید ئاغـاو حـاجی عـەلی ئاغا) بـۆ تەبـدیلی هـەوا چوونەتە بەغدادو (حاجی برایم ئاغا)ش بۆ کاروباری بازرگانی سەفەری کردووە هەمەوەندەکانیان داویانەتە سەر چەند دێیـەكو تاڵانیـان کـردووە تـاڵانو بـڕۆی ئەم هۆزە شتێکی تازە نییە.

کوشتەی خزمەکەی فەتاح بەگ سۆفیوەندەکانە. ئـەو تەقانـەی شـەو کراوەتـە سـەرماڵی (ئـەوڕەحمان ئاغـای گـەورە) لەلایـەن پیاوەکـانی خۆیـەوە کـراوە، لـەم تەقەیە بەر پیاوێکی خۆی کەوتووەو برینداری بووە.

شێخ مەحمەد غەریبیش لە (ئەنلوس) دەست درێژی لەسەر کەس نـەکردووە. بـەم زووانـە وا چاوەڕوان دەکـرێ حکومـەت بـچێتە سـەر هەمەوەنـدەکانو ئـەم تاڵانییانەی لەم دواییـە کردوویانـە لێیان وەربگیرێو بدرێتـەوە خـاوەنی خـۆیو ئەوانەی خزمەکانی فەتاح بەگیان کوشتووە دەردەست بکرێن.

خوێنەری بەرێز: ئێستا بۆت دەرکەوت ئەو نووسینانەی کە خاون ڕۆژنامەی (الارشاد) بڵاوی کردبووەوە لەدرۆیەکی رووت بەولاوە هیچی تر نییەو نەوعە زمان درێژییەکە لەبارەی یەکێك لەوالییەکانمان هەروەها دمیەوێ هەچ خراپەیەك لەم شارە کراوە بیداتە پاڵ شێخەکان‌و دانیشتوانی شارو شێخان بدا بەگژیەکدا تا ئەمن‌و ئاسایش لەشاردا هەڵبگیرێ، ئەم رەوشتە ئەوپەڕی بێ ویجدانییە. ئێمە بەناوی بەرژەوەندی گشتییەوە داوا لەرۆژنامەی (الارشاد)و خاوەن مەقالەکە دەکەین ئەگەر خۆیان بە دڵسۆزی ئەم نیشتمانە دەزانن دەبێ هەوڵی ئەوە بدەن کە بەرەی شێخان‌و دانیشتوانی شار پێکەوە ئاشت بکەنەوەو مەیدان بە بلاوبوونەوەی شتی درۆو هەڵە نەدەن لەرۆژنامەکاندا بلاوبکرێتەوە، ئومێدەوارم ئەم هیوایەمان جێبەجێ بکرێ.

## بەڵگەی ژمارە (٦)

ئەمە وێنەی ئەو ئیفادەیەیە کە رۆژی (٤ی حوزەیرانی ١٣٢٥) لەدادگای بیدایەتی سلێمانی وەرگیراوە:

بۆ گوێ گرتن لەفەرمانی سەڵتەنەتی پادشاهی لەبارە دانان‌و بڵاوبوونەوەی یاسای ئەساسی‌و بانگ کردنی ئەنجومەنی مەبعووثان بۆ کۆبوونەوە داوا کرا هەموو دانیشتوانی شار بە مشایخ‌و زاناو ناودارانەوە لەبەر دەرگای سەرای حکومەت ئامادەبین، لەناو بانگ کراوەکاندا خوالێخۆشبوو شێخ سەعید ئەفەندیی‌و کوڕەکانیش هەبوون هەموو ئەو خەڵکە لەگۆڕەپانی بەر دەرگای سەرای حکومەت ئامادەبوون فەرمانبەران‌و سەربازانیش لەولاوە هەموو بەڕیز وەستان، ئەم نمایشە رێکەوتی رۆژی چوونە سەرتەختی پادشاهی بوو پاش خوێندنەوەی تەلغورافی پادشاهی بۆ ئەو مەبەستە ئەو خەڵکە هەموو بەجارێ سوێنددران کە گوێڕایەڵی ناوەرۆکی خاڵەکانی یاسابین‌و پەیڕەوی بکەن‌و لێی

لانەدەن‌و هەر ناکۆکییەکیان لەئارادا هەیە دەبێ نەمێنێت‌و لەجیاتی ئەوە یەکێتییەکی گشتی بێتە ناوەوە، بەڵام هەندێ لەو کەسانەی کە سوودی تایبەتی خۆیان نەبێت هیچی تریان مەبەست نییە وەك فەرماندەی پێشووی سوپا مستەفا پاشاو فەرماندەی ئێستا قوڵ ئاغاسی (٣٨) ساڵح‌و جێگری سەرۆکی هێزی جەندەرە فەهمی‌و دوکتۆر ضیاء و سەرۆکی دادگای جەزا (ئەحمەد رەفعەت)و سەرنووسەری دادگا (دەروێش)و فەرمانبەری ئیجرا (نەجیب) و ئەفسەری تەجنیدی سەرچنار (حاجی عەبدوڵلا)و هەردوو فەرمانبەرانی تەلغوراف (ئەدیب‌و ئەحمەد)و عەبدولعەزیز ئەفەندیی موفتی لەناوخۆیاندا رێککەوتنێکی نهێنییان دژی شێخان گرێ دابوو، ئەو کەسانەش کۆنە قینێکیان دژی شێخان هەبوایە، ئەوانیشیان هان دەداو دەیانهێنایە ناو رێککەوتنەکەیانەوە، بۆ داپۆشینی ئەسڵی مەبەستیان دژی شێخان هاتن هەندێ شکایەتی ناڕەوایان کردو ئینجا هاتن ئەو رێکەوتنەیان خستە قاوغی کۆمەڵی ئیتتیحادو تەرەققییەوە ئینجا بەو ناوەوە خۆیان ئاشکرا کرد.

ئینجا ئەو فەرمانبەرانە بەهۆی پایەیانەوە لەفەرمانەکانیانداو مەوقعیان لەکۆمەڵەکەیاندا لەناو بازاڕو کووچەو کۆڵانەکاندا بە ئاشکرا دەستیان دایە شەڕفرۆشتن دژی بەرەی شێخان‌و لەرۆژانی ئاهەنگی رەسمیشدا ماوەیان نەدەدا بەرەی شێخان جێ‌و مەقامی شیاوی خۆیان بدرێتێ، ئینجا لەرۆژنامەکانی ئیتتیحادو تەرەققیشدا هێرشیان دەبردنە سەر، ئەندامانی کۆمەڵە دەیانزانی حەزرەتی شێخ سەعید ئەفەندی زاتێکی چاکە خوازو خاوەن پایەو مەقامە بۆ وەدەست هێنانی ئامانجی تایبەتی خۆیان بێ ئەوەی گوێ بدەنە سەرەنجامی مەسەلەکە وەك لەدڵی خۆیاندا بڵێن ـ هەرچی دەبێ بابێ ـ دەستیان دایە پیلان رێکخستن دژی شێخان وەك ئەوەی پاش جەژنی رەمەزان بەچەند رۆژێك لەکوڕەکانی شێخ سەعید، شێخ مەحموودو شێخ ئەحمەد هەروەها سەید

ئەحمەدی بابا رەسول‌و شێخ سالّح ئەفەندیی موفتییان بە بیانووی ئـەوەی گوایـە قەرداری حکومـەتن، چوون بـەهێزی جەندرمـە هێنایـانن‌و لەسـەرای حکومەتـدا تەوقیفیان کردن‌و دەوریان بە چەکدار گرتن ئینجا دوکتـۆر زیـادو و سـالّح قـۆلّ ئاغاسی‌و فەهمی ئەفەندیی یوزباشـی کەوتنـە نـاو بـازاڕو لـەناو خەلّکدا بلاّویـان کـردەوە: حکومـەت شـێخانی حـەپس کـردووە، هەسـتن، ڕاپـەڕن، ئەوانـەی کـە لەگەلّیاندا نەبووە پێیان دەوتـن بـڕۆن بـۆ بـەردەمی سـەرا وا فـەرمانی حکومـەت دەخوێنرێتەوە ئەو کەسەی نەچێت سزای دەخرێتـە سـەر، بـەم شێوەیە دوکـان‌و بازاڕیـان پـێ داخسـتن‌و ئـەو خەلّکـەیان بە کۆمـەلّ لەبـەردەم سـەرادا کـۆکردەوە ئەوانەی بـێ لایەن بـوون دزەیـان بـۆ دەکـردو دەردەپـەڕین ئەوانەشیان دوژمنـی شێخان بوون بە زۆر دەیانبردنە دایـەرەی پۆسـتەو دژی شـێخان ئـەلغورافیان پـێ لـێ دەدان. بەم شێوەیە دوو ڕۆژ لەسەر یەك حەشاماتیان لەو گۆڕەپانە کۆکردەوە تاوەکو لەرۆژی سێیەمدا فەرمانی دورخستنەوەیانیان بۆ موسلّ وەرگرت.

بەمەشەوە نەوەستان، بـە بیـانوی وەرگرتنـی قـەرزی میرییـەوە چـەکدارەکانی حکومـەت دەچـوونە سـەر مـالّو خێزانـی شـێخانی دوور خـراوو ئـافرەت‌و منداڵەکانیان دەترسـاندن تـاوەکو ژنـی شـێخ ئەحمـەد لـەژێر ئـەم تـرس‌و بیمـەدا منداڵێکی لەبارچووە هەروەها هاتن چەند دەعوایەکی بێ بناغـەیان دژی شـێخان ڕێکخسـت‌و شـایەتی درۆیـان بـۆ تاشـی بـۆ ئـەوەی حـوکم بدرێتـە سـەر ئـەفرادی شێخان، شـێخ عـەلی کـە ژنـبرای شـێخ مـەعرووفی نەقیبـە لەماڵەوە کـەوتبوو بـە زۆری زۆرداری چۆن لەناو دوێنـێ نەخۆشی دەریکردن دایان بـەکۆلّی سـەربازێکدا بۆ ئابڕوو بردن بازاڕو کۆلانەکانیان پـێ گێڕا.

ئـەم کـارو کـردەوە ناپەسـندان هـیچ پێوەندییـەکی بـە ڕۆحـی ئیـدارەو مەشـرووتییەتەوە نییـە پـاش ئـەوە هـاتن زۆر بـەنهێنی پیلانیـان بـۆ هێنانـە دی کارەساتەکەی موسلّ هۆنینەوە.

جارێکیان موتەسەریفی پێشوو (تەوفیق پاشا) بەرەو بەغدا بەڕێ دەکەوێ جەردە ڕێی لێ دەگرێ هاتن ئەمەشیان دایە پاڵ خزمان شێخەکان (٣٩)، ئا بەم شێوەیە بە زۆری زۆردارەکی شێخان لەحاڵو ماڵی خۆیان دوور خرانەوە لەئافرەتی زەعیفە بەولاوە کەسیان لێ بەجێ نەمایەوەو هاتن لوولەی تۆپو تفەنگیان لەم ئافرەتە بەسەزمانانە دەگرت تا بییان تۆقێنن، چەکیانیش دابەش کردە سەر ئەوانەی سەر بەخۆیانن‌و ئەو خەڵکەیان هێنایە هەڵچوون‌و ئاسایشیان لەئارادا نەهێشت.

بەمە خاوو خێزانی شێخانیان خستە بەردەم کارەساتێکی گەورەوەو کاریان کردە سەر دانیشتوانی شارو خستنیانە پێش دەم ڕووداوێکی گەورەوە، هەر کەسە لەئەهلی بازاڕ ملی بۆ فەرمانەکانیان درێژنە کردبایە هەڕەشەیان لێ دەداو تانووتیان تێ دەگرتن بەمە ئاسایش لەناودا هەڵگیراو ئازادی لەئارادا نەماو شیرازەی ئیدارە پچڕا، خودا سزای ئەو کەسانە بدات کە بوونەتە هۆی بەرپابوونی ئەم گرفتارییە، ئامین.

وەڵامدانەوەی دووەم پرسیار: پێش ئەم ڕووداوە مەحموود پاشای جاف بانگ کراو پاش ئەوەی شێخان تەوقیف کران، مەحموود پاشا چەند سوارەیەکی ئامادەکرد، من نازانم لەبەرچی بوو، کە موتەسەریف پاشا ڕووت کرایەوە، مەحموود پاشا جڵەوی ئیداری گرتە دەست، من نازانم بەپێی فەرمانێك ئەمەی کردووە یان هەر لەخۆیەوە. لەوانەی لەدەرەوەی شار سەر بە شێخانن هیچ کەسێکیان لێ نەهاتووەتە ناو شارەوە.

وەڵامدانەوەی سێیەم پرسیار: هەر لەو ڕۆژانەدا بیستم لەوانەی سەر بەشێخانن هەندێکیان لێ تەوقیف کراوە.

## بەڵگەی ژمارە (٧)

وێنەی نووسراوی موتەسەریفێتی سلێمانی ژمارە (٣٥٠)ی رۆژی (٢٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٣٢٥) بۆ عیززەت ئەفەندی ـ ی نووسەر لەئەنجومەنی ئیدارەی لیوا (٤٠)

بەپێی یادداشتی جێگری مودەعیی گشتی لەوەزیفەی (موستەنطیق) (٤١) داناراو لەئەنجومەنی ئیدارەی لیوا کە ماوەیەکی شاغیرە. لەبەر ئەمە پێویستە هەر ئەوراقێك عائید بەئیستینطاق هەیە وەری بگریو دەست بکەی بە فرمانەکەی خۆت کە پێت سپێردراوە.

## بەڵگەی ژمارە (٨)

بسم الله الرحمن الرحیم

وێنەی ئەو سکاڵانامەیەم کە لە (١٨ی کانوونی دووەمی ١٣٢٥)دا (٤٢) بۆ ویلایەتی جەلیلەی موسڵم پێشکەش کرد.

لەهەموو وەختێکدا لیوای سلێمانی لایەن سەڵتەنەتەوە بە چاوێکی تایبەتەوە تەماشا کراوە منیش لەم ڕەوانگەیەوە زات بەخۆم دەدەم ئەمەی خوارەوەتان بۆ دەبڕم:

لەسندوقی مالییەی سلێمانی پێنج سەد لیرەو هەنێ دزرابوو ئەو دزێتییەش لەلایەن دادگاوە لێکۆڵینەوەی (٤٣) لەسەر کرا، بەڵام کاربەدەستان کاریان کردە سەرو بڕیاریاندا لەلایەن ئیدارەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ، گومان لەوەدا نییە کە دزی کردن تاوانێکی شەخسییە دەبێت لەلایەن دادگاوە لێی بکۆڵرێتەوەو بڕیاری لەسەر بدرێ گوێزانەوەی بۆ جێهەتێکی ئیداری بۆ کارتێکردنو مەبەستێکی خراپە، لەبەر ئەمە جێگری مودەعیی گشتی بڕیاریدا دەبێ ئەم لێکۆڵینەوەیە لەلایەن موحەققیقی دادگای بیدایەتەوە بکرێو بڕیاری لەسەر

بدرێ، لەبەر ئەمە رۆژی (٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٣٢٥) ئەو ئەوراقە گەڕایەوە دادگا.

سپاردنی ئەم مەسەلەیە بۆ لایەنێکی ئیداری گومانی خستە ناو مەسەلەکەوەو ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی ئەمینی سندوق دەستی لەکار بکێشرێت، بەپێی یاسا دووبەرەکی کەوتە نێوان دوو موستەنتیقەوەو بەهیچ کلۆجێك نابێت ئەمە ببێتە هۆی بەرەڵلاکردنی گومان لێ کراوێك و لەدادگایەکی ژوورترەوە فەرمانی بۆ دەربکرێ، ئەمە منی تووشی هەڕەشە لێ کردن و قسە پێ وتن و چاوترساندن کرد منی کۆیلەی بێ دەسەڵات تا ئێستا کەس کاری تێ نەکردووم مەبەستی من لەناو نەچوونی خەزێنەی دەوڵەتە. مەبەستم پارێزگاری کردنی یاسایە کەچی لەم پێناوەدا قسەی سووکم پێ کراوە منیش خۆم ڕاگرتووەو بەرگریم لێ کردوون و ئەوەشم بیستووە کە دەسەڵاتدارانی زەبر بەدەست کەوتوونەتە دژایەتیی بەندەوە.

من بە درێژایی سەردەمی ئیستیبداد ئێش و ئازارم چێشتووەو لەفەرمانبەرێتیمدا لەرێگای راست لامنەداوە ئێستاش لەسایەی مەشروتییەت و سەربەستی هەرگەرمم بوو سارد نەبوومەتەوەو بەڵگەیەکی زۆرو زەبەنم بە دەستەوەیە بۆ چەسپاندنی وتەکانم کەچی وا ئێستا دەبینم لەسەر ئیشعارێك کە لەگەڵ رۆحی عەدالەتدا ناگونجێت ـ پرس و لێکۆڵینەوەم لەسەر دەکرێ، من لەو بڕوایەدام کە ئێوەی پایە بەرز لەویلایەتدا رێگا بەو نەوعە کەسانە نادەن ئەو هەڵپەرستانە دەیانەوێ لەژێر پەردەی عەدالەتدا ئامانجی تایبەتی خۆیان جێبەجێ بکەن، من ئەم سکالایەم بۆ ئێوەی بەرێز بەرزکردەوەو چاوەڕێی دادپەروەریتم.

## بەڵگەی ژمارە (٩)

وێنــەی ئــەو سـکالانامەیەی کـە لەگـەڵ بەڕێوەبـەری تـەحریراتی سـلێمانی نـووڕەددین ئەفەنـدی پێکـەوە ڕۆژی (٢٣ی کـانوونی دووەمـی سـالی ١٣٢٥) بـە تـەلگراف داومانەتــە ویلایــەتی جەلیلــە: بەداخــەوە لــەم ڕۆژانــەدا زۆربــەی کاربەدەستانی لیوای سلێمانی بریتین لەپیاوانی بـێ بـەهرەو گێرەشێوێن‌و ڕاڕاو لەهەموو هەنگاوێکیاندا دژی یاساو شـەریعەتن‌و مەبەستیان تـەنیا پڕکردنـەوەی گیرفانی خۆیانەو بەس، شیرازەی دادگەری‌و ئاسایش پچڕاوە، خستنە بەرچاوی ئەم ڕاستییانە لەسەردەمی ئیستیبداددا قەدەغـە بـوو ئەگـەر سکالایەك لـەبارەی ئـەم دسـت درێژییانــە بکرایــە لێکۆڵینــەوەی لەســەر نــەدەکرا بــەڵکو لــەخودی ستەمکاران پرسیار دەکرا.

ئێمە عەرزی ئێوەی بەڕیز دەکەین کـە تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان سـلێمانی سـوودی لەســەردەمی پــیرۆزی مەشــرووتییەت وەرنــەگرتووە دیــارە ئەمــە حیکمــەتێکی خودایی تێدایـە، موتەسـەریفی ئـەمڕۆمان لەبەڕێوەبەرێتیـدا سـەرکەوتوو نییـەو ئەویش بەشوێن مەبەستی تایبەتی خۆیدا دەگەڕێ.

ئەو کەسەی کە پێنج سەد لیرە پارەی دزیوە لەپێشدا لەلایەن دادگای بدایەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا، بەلام موتەسەریف بەپێی دەسەلاتی خۆی مەسـەلەکەی خستە ژێر دەست ئیدارەوە تـا ئـەو کـابرای دزە ڕزگـار بکـات‌و بیلفیعـل (بالفعـل) بەرەڵلای کردو هات تەنگی بـەمن هەڵچنی وەختــێ کە بینـی ئێمـە لەسـەر ئـەو دەعوەیە سوورین‌و دەست لەو دەعوایە هەڵناگرین ئینجا هەوڵیدا لێکۆڵینـەوە کـە لەلایەن کەسانی سەربەخۆیانەوە بکرێ.

ئەوانەی وەك ئەو موتەسەریفە ئیدارەی ئەم لیوایەیان شێواندووە غـەفووری سەرۆکی پێشووی شارەوانیی سلێمانییە ئەم پیاوە لەژێر پەردەی مەشرووتییەتدا هانی ئەو کەسانە دەدات کە جاران سەر بەئیستبداد بوون دژی ئەوانەی کاروباری خۆیان بـە دڵسۆزی بەجـێ دەهێـنن ئێمـە لەهـەموو هەڵچوونێکی سـلێمانیدا بــێ

لایەن وەستا بووین فەرمانی رەسمی خۆمان جێبەجێ دەکردو دژی کەس نەبووین، ئەوان هەتا ئێستا خەریکن ئەهالی هان دەدەنو بەمە نێوان فەرمانبەرانو دانیشتوانی شار دەشێوێننو تۆوی دووبەرەکی دەچێننو خەریکن فیتنەیەك بەرپا بکەنو موتەسەریفیش لەم کارەدا پشتگیرییان دەکات.

ئێمە کە خۆمان بەکەسانێکی بێ گوناهـ و ستەم لێ کراو دەزانین لەئێوە داوا دەکەین لەم سەردەمەی عەدالەتەدا ستەمکاریمان لەسەر هەڵبگرن بۆ بەجێ هێنانی ئەم مەبەستە چاوەڕێ دەکەین لێکۆڵینەوەیەکی دروست بێ لایەن بکرێ ئەوساکە درۆو راستییان بۆ دەردەکەوێ، چاوەڕێی ڕەحمەتی ئێوەین.

## سەرنجام دەگەینە ئەوەی بڵێین

١. کارەساتی کوشتنی شێخ سەعیدی حەفید لەموسڵ ئەڵقەی دووەم بووە لەو ئەڵقانە کە بەرەی ئیتتیحادو تەرەققی هۆنیویانەتەوە (یەکەمیان) لەسلێمانی هەڵیان گیرساندووەو کە ناودارەکان و شێخەکانیان گرتووەو خەڵقیان هان داوە دژی ئەوان بروسکە لێ بدەن بۆ موسڵ و ئەستەموڵ بۆ دوورخستنەوەی شێخ سەعید.

(دووەمیان) لەموسڵ ئەوە جێبەجێ کراوە کە شێخ سەعیدو براو هەندێ لەخزمو کەسانی شەهید کراون.

(سێیەمیان) لەرۆژنامەکاندا بەرەی ئیتتیحادو تەرەققی ج لەکارەساتی سلێمانیو ج لەکارەساتی موسڵ دژی شێخان وەستاون.

٢ـ دووری کۆمەڵەی کورد لەئەستەموڵ بەسەرۆکایەتیی شێخ عەبدولقادر لایەنگیری شێخان بوون راستیی کارەساتەکەیان شی کردۆتەوە ئەوەیان کردووە کە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم رووداوە بکرێت.

ئومێدەوارم بەم نوسینە خزمەتێکی مێژووی کوردی ئەو سەردەمە کردبێت و نووسەرانی داهاتوومان کەڵکیان لێ وەربگرن..

## پەراوێزەکان

١ـ ئەو بەتوورکی (عریضة)ی بەکارهێناوە ئێمە لێرەدا سکاڵا نامەمان بەکارهێناوە.

٢ـ ساڵی (١٣٢١)ی رۆمی ـ ساڵی رۆمی ـ دەکاتە (ساڵی (١٩٠٥)ی زاینی.

٣ـ ئەم شارە ـ واتە شاری سلێمانی.

٤ـ نووسەر نموونەی ئەدەبی بەرزی ئەو سەردەمەی لەسکاڵانامەکەیدا بەتوورکی بەکار هێناوە، ئێمە خستمانە سەر زمانێکی سادە.

٥ـ لەسەدەی پێشوودا، سلێمانی (سەنجەق)ێك بوو سەر بەپارێزگای شارەزوور کە شاری (کەرکوك) چەقی ئەم پارێزگایە بووە.

٦ـ خان ـ کاروان سەرا.

٧ـ ڕەنگە ئەم جۆرە حەوزانە بۆ فەرمانبەرە تورکەکان تەرخان کرابن، چونکە کوردی سلێمانی هەموو شافعی مەزهەبن.

٨ـ لەورۆژگارەدا، شێخ مەحمود لەتافی لاوێتیدا بوو تەمەنی نزیکەی (٢٣) ساڵ دەبوو.

٩ـ گوێك تەپە، واتە (گردە شین) لەکوردیدا کراوە بە (گۆپ تەپە).

١٠ـ تەرخانیو ڕۆخزایی دوو تیرەی گەورەی هۆزی جافنو لەشۆڕشەکانی شێخ مەحموودا، پشتیان بەرنەداوە.

١١ـ ئەو وەسفی شاری سلێمانییە، وەك کەرەستەیەك بۆ نووسەران کەڵکی تایبەتی خۆی هەیە.

١٢ـ بەرانبەر (استجواب) پرسو لێکۆڵینەوەم بەکار هێناوە.

١٣ـ بەرانبەر (مجلس مەبعوثان) ئەندامانی پەرلەمانم بەکار هێناوە.

١٤ـ چوونە سەر تەخت (تتویج) لەسەردەمی پاشایەتیدا لەعیراق (جلوس) یان بەکار هێناوە.

١٥ـ خەلیل منەومر ـ ی شاعیر لەم بابەتەوە لەداستانەکەیدا دەڵێت:

جەم بین چەن نەفەربێ رەحمو ئینصاف

پەی موڵك (بەغداد) کێشان تەل غوراف

یەکك تەلێ دیگەر بە (موصڵ) ماوا

تەل کاری کردن، صوب تا خۆراوا

چەن تەل غورافێ پەی (باب عالی)

پەی (شێخ الاسلام) میر لیواو والی

١٦ـ یوزباشی ـ واتە سەرکردەی (سەت کەس) بەرامبەر بەپایەی عەسکەری (نەقیب)ی ئەمڕۆی سوپایە، شاعیرێکمان وتوویەتی:

ئەڵێن دۆمێکیان کردە (یۆزباشی) لەپێشدا سەری دایکی خۆی تاشی

١٧ـ مەبەستی لەیەکەم والی ـ ی سەردەمی حوکمڕانی بەرەی ئیتیحادو تەرەقییە.

١٨ـ پرس و لێکۆڵینەوە لەفەرمانبەرە بێ لایەنەکان کرا بێئەوەی ناویان ئاشکرابکەن.

١٩ـ جاران لەهەر شارو شارۆچکەیەك دوو ئەنجوومەنی (شارەوانی)و (ئیدارە) هەبوون و شێوە هەڵبژاردنێك بۆ ئەندامانی شارەوانی هەبوو، بەڵام ئەنجوومەنی ئیدارە لەلایەن حکومەتەوە دادەنرا.

٢٠ـ گوڵعەنبەر ـ ناوی ئەم سەردەمەی شارۆچکەی (هەڵەبجە) بوو.

٢١ـ مەبەست لەعوسمان پاشای حەمە پاشای جافە (١٨٤٧ـ ١٩١٠) مێردی خانمی ئەردەڵان و باوکی هەردوو (ئەحمەد موختارو تاهیر بەگی جاف)ە سەردەمێ قائیمقامی هەڵەبجە بووە.

٢٢ـ بەتوورکییەکەی (ردیە صورتیدر) لەم رستەیە (در) تورکییەو ئەو دوو وشەکانی دیکە عەرەبین.

٢٣ـ لەسەردەمی ئیتیحادو تەرەققیدا لەبەغداد سێ رۆژنامە دەردەچوو (بغداد - الارشاد الحقيقة) لەوڕۆژانەدا (كاظم حسن الدجيلي ١٨٨٤ـ ١٩٧٠)ی خودا لێخۆشبوو یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی ئەوکۆمەڵەیە لەبەغدادو لەنووسینی هەرسێ رۆژنامەکاندا قەڵەمی لەکاردابوو، لێپرسراوی رۆژنامەی (الارشاد) (حسين جاهد)و ڕۆژنامەی (الحقيقة) (مجيد طلعت) بوو.

کە بەرەی ئیتیحادو تەرەققی لەعوسمانێتییەوە دروشمی تورکیزمیان هەلگرت (كاظم الدجيلي) لێیان کشایەوەو دژیانیش وەستا.

بۆ زێدە زانیاری بڕوانە گۆڤاری (أفاق عربية) ژمارە یەکی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٣) نووسینێك لەمبارەیەوە بەقەڵەمی (رفعت عبدالرزاق محمد) بەناونیشانی (شخصيات عرفتها - أظواء ثقافية).

٢٤ـ ئەوسا لەنووسینە رەسمیەکانی حکومەتدا لەجیاتی (ئەستەمبوڵ) وشەی (دەرسعادت) دەنووسرا.

٢٥ـ بە تورکی ڕستەی (ژورنا ڵچیلق) یان بەکار هێناوە واتە بەدرۆ ڕاپۆرت نووسین.

٢٦ـ ئەمکارانە، هەموو ئەندامانی ئیتتحادو تەرەققی کردوویانە بۆ ئەوەی شێخان لەناوبەرنو خۆیان جڵەوی کار بگرنە دەست.

٢٧ـ مەحموود پاشای کوڕی حەمە پاشای کەیخەسرەوبەگ (١٨٤٥ـ ١٩٢١) پاش کوشتنی حەمە پاشای باوکی لەساڵی (١٣٠٨)ی کۆچییەوە، سەرکردەیی هۆزی وەرگرت، لەپێشدا بوو بە قایمقامی گوڵعەنبەر، دوایی نەقڵ کرایە پارێزگایی (ئورفە - رەها).

زێوەر، لەیاداشتەکەیدا دەڵێت (٧٠)ـ (ئەم زاتە دووجار لەتەرەف سوڵتان (عبدالحمید)ەوە تەکلیفی وەزیری لێ کرا قبوڵی نەکرد) بانگ کرایە ئەستەمووڵو سێ ساڵ لەوێ دەسبەسەر مایەوەو توانی بەهۆی ناودارە

کوردەکانەوە خۆی بگەیەنێتەوە کوردستانو ناو هۆزەکەی خۆی، بەرانبەر ئەم ئازایەتییەی دەوڵەتی عوسمانی لێبوردنی بۆ دەرکردو پایەی (بەگلەر بەگی)ی پێ بەخشرا، مەحموود پاشا ئەدەب پەروەرو دەستی شیعر نووسینیشی هەبوو هەوڵی دەدا بۆ بەرزێتی قەومەکەی خۆی (بڕوانە مێژووی ـ مشاهیر الکرد وکوردستان، چاپی ١٩٤٧، محەمەد ئەمین زەکی).

که ئیمارەتی بابان ساڵی (١٨٥١) هەرەسی هێنا بەرەی شێخان ئەو کەلەبەرەیان لەسلێمانیدا پڕکردەوە، لەناودارانی جاف چ (حەمە پاشا)و چ کوڕەکانی لەوە زیاتر کە قەوارەی هۆزەکەی خۆیان بپارێزن چاویان لەحوکمدارێتی سلێمانیو کوردستان نەبوو. هەمیشە کاربەدەستانی تورکی عوسمانی، هەوڵیانداوە دووبەرەکی بخەنە ناو کوردەوە، هەوڵو ئامانجی ئەو پاشایەی سلێمانیش یەکێکە لەوپیلانە گلاوەیان. پێوەندی نێوان پیرەمێردو مەحموود پاشا پتەو بووەو پیرەمێرد لەژیندا زۆری لەسەر نووسیوەتەوە، ئەم زاتە مافی ئەوەی هەیە شتێکی لەسەر دەربکرێ.

٢٨ـ تورکیش وەك عەجەم لەجیاتی شۆڕش (ئینقیلاب) بەکار دەهێنن ئەمە لەعەرەبی کۆنیشدا بۆ ئەومەبەستە بەکار هاتووە.

٢٩ـ (ڕێڕەو) بە عەرەبی (مسیرە) لەتورکییەکەدا هەیە (جانو نومایش)ی بەکار هێناوە.

٣٠ـ ئەم دکتۆرە (ضیاء)ناوە وادیارە تورك بووەو یەکێك بووە لەئەندامە هەرە بزێوەکانی ئیتیحادو تەرەقی لەسلێمانی.

٣١ـ لێرەدا خەلیل منەوەر دەڵێت:

تا ئاخر فەرمان هات لەئەستەمووڵ

شێخان سەوق بیۆپەی شار مووصڵ

بەئەمرو فەرمان زات شاهانە

شێخان پەی مووصڵ گشت بین ڕەوانە

٣٢ـ ئەو بۆ ئەمە (ئەسرار ئەنگیز)ی بەکار هێناوە.

٣٣ـ شێخ عەبدولقادری شەمدینی، سەرۆکی کۆمەڵی (تعالی‌و ترقی کورد) بوو لەئەستەمووڵ، ئەمە یەکەم ڕێکخراوی کوردەو بەڕێزان (شەریف پاشا)و (ئەمین عالی بەدرخان) ئەندامی ئەو کۆمەڵە بوون. بڕوانە ـ کردستان فی سنوات الحرب العالمیه الاولی، د. کمال مظهر أحمد، ١٩٧٥ ص ١٠٠، هەروەها بڕوانە کتێبی الجمعیات والنظمات والاحزاب الکردیه فی نصف قرن ١٩٠٨ـ ١٩٥٨ د. عبدالستار طاهر شریف، ١٩٨٩، ص ١٩.

٣٤ـ خەلیل منەوەر لەم بارەشەوە دەڵێت:

قورب یەك هەفتە دوو هەزار سوار

ئامان وەئیمداد شێخان سالار

موهەییا بیین شێران سەرحەد

پەرێ ئینتیقام خوون شێخ ئەحمەد.

٣٥ـ کە سکاڵایەك بۆ کاربەدەستێك ڕەوانە دەکرا دەبێت بەرامبەرەکەی گەورەو خۆی زۆر بچووك بکاتەوە، ئەمە دابو نەریتی کاغەز نووسینی ئەو سەردەمە بووە، شوێنەواری ئەمە لەسەردەمی پادشاهێتیی عیراقیشدا مابوو کە سەرۆك وەزیران بەرامبەر پادشاهانی عیراق خۆی بە (العبد المطیع) پیشان دەدا کۆیلەیەتیش بەرامبەر خوا ئەبێت‌و بەس پێغەمبەرمان فەرموویەتی (متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتم أحرارا؟).

٣٦ـ وا دیارە هیچ فەرمانبەرێك نەیتوانیوە سەربەخۆ هیچ کەرستەیەك لەڕۆژنامەکاندا بڵاوبکاتەوە تا موافەقەتی فەرمانبەری لەخۆی بەرزتر وەرنەگرێ، بۆیە ئەم هەق خوازەش وەڵامدانەوەکەی ناردوومتە مەرکەزی ویلایەت بۆئەوەی موافەقەتی لەسەر بکرێ.

٣٧ــ مەبەستی لەدەوری ئیستیبداد دەوری سەڵتەنەتی عەبدولحەمیدی دووەمە.

٣٨ـ قوڵ ئاغاسی روتبەیەکە لەسوپای تورك.

٣٩ـ لێرەدا ئەو ڕستەی (ساداتن بقیة السیوفی أولان) واتە دایانە پاڵ ئەوانەی لەشمشێرەکانی سادات ماونەتەوە.

٤٠ـ لەنووسینەکە دەڵێت (رفعتلو عزت أفندی) ـ رفعتلو ـ واتە خاوەنی پایەی بڵند (صاحب المقام الرفیع) لەسەردەمی پادشاهێتی لەمصردا ئەم نازناوە بۆ سەرۆك وەزیران بەکاردەهێنرا وەك (صاحب المقام الرفیع مصطفی النحاس باشا).

٤١ـ مستنطق (موستەنتیق) ـ واتە ـ محقق، ئەو کەسەی لەدادگادا لێکۆڵینەوە دەکات.

٤٢ـ من وابزانم ئەم مێژووە بەپێی زنجیرەی ڕووداوەکان ساڵی (١٣٢٦) بێت نەك (١٣٢٥)ی ڕۆمی.

٤٣ـ بەرامبەر (تحقیق) لێرەدا لێکۆڵینەوەم بەکارهێناوە.

## مەجلیسی تایبەتی بۆ لیوای سلێمانی

لەپێشکەوتنی حەفتەی رابردوو شتێك باسی مەجلیسی تایبەتی لیوای سلێمانی کرابوو ئەمجارەش وا باسی دەکەینەوە.

لەمەوپێش بڕیار وابوو کە (٤) لەخەڵکی سلێمانیو (٤) لەخەڵکی قەزاکانو (٤) لەمەئمورانی ئەعزا دەبێ، بۆ هەڵبژاردنی (٤) ئەعزا لەخەڵکی سلێمانی وەها کرا. رۆژی (١٥)ی مانگ بەپێی دەفتەری بەلەدیە لەوانە کە خانویان هەزارو هەزار روپیە زیاتر بوو (٢٠٥) کەس نووسرا کە رۆژی یەك شەممە (١٦)ی مانگ لەسەعات (٣)ی غروبیەوە بێنە دائیرەی سیاسی بۆ نواندنی بیری خۆیان بۆ ئەو (٣١) کەسە کە دانرابوون لەوە (٤) کەسیان لێ هەڵبژێرێت بۆ ئەعزاییەتی ئەم مەجلیسە.

ئەو (٣١) کەسەش ئەمانە بوون: جەنابی حاجی حەسەن نەورەس ئەفەندی، حاجی سەعید ئاغا، محەمەد ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا، حاجی مەلا سەعید ئەفەندی، عەزمی بەگی بابان، مەلا حسین ئەفەندی پسکەندی، عەزیز ئەفەندی موفتی، شێخ بابا علی ئەفەندی، شێخ محەمەد ئەفەندی بەرزنجی، حاجی ئاغا فەتحوڵلا، عزمت بەگ، عەبدولفەتاح چەلەبی، غەفور ئاغا، فەتاح بەگی حاجی ئیبراهیم بەگ، سەید نوری ئەفەندی نەقیب، حاجی مەلا محێدین ئەفەندی، حاجی ئیبراهیم ئاغای خەفاف، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، جەمال بەگی عیرفان، مەجید ئەفەندی حاجی رسول ئاغا، حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم، حەمدی بەگی رشید پاشا، محەمەد بەگی فەتاح بەگ، عەبدولکەریم ئەفەندی ئەلەکە، ئەحمەد ئاغای حاجی عەبدوڵلا، حاجی ئەمین کاکە حەمە، حاجی مەلا سەعید شاڵی، حاجی کاکە حەمە، صالح ئەفەندی قەپتانچی، حاجی کەریم منبرخان، خواجە یونتوب.

رۆژی (١٦)ی مانگ لەسەعات (٣)وە لەو (٢٠٥) کەسە کە نووسرابوو بەشوێنیاندا بووە وە تەشریفیان بردە دائیرەی سیاسی کە دەچونە ژوورەوە کاغەزی کە ناوی ئەو (٣١) کەسەی تیا نووسرابوو دەدرایە خزمەتیان هەچکەس کەس بەبیری خوی (٤) راستو چەپی لەبەرامبەر ناوی ئەوانە دەکرد کە لای باش بوو. پاشا ئەو کاغەزە راستو چەپ کراوە دەخرایە ناو سندوقی کە درزێکی هەبوو دەرگای قوفڵ دابوو. هەتا سەعات ١٠و نیو چاوەڕوانی کرا لەو ٢٠ کەسە (١٦٤) کەسی هاتو (٤١)ی نەهات ئەو (٤١) کەسە وا دەزانم لەناو شار نەبوون بۆ توتن داگرتنو شت چوبوونە دەرەوە لەبەرئەوە نەهاتن.

پاش ئەوە کە زانرا ئیتر کەس نایەت سندوقەکە کرایەوەو کاغەزە راستو چەپ کراوەکان هێنرایە دەرەوە پاش وردبونەوەو تەماشا کردن دەرکەوت ئەوانەی رای زۆریان بۆ دراوە بە جەنابی حاجی سەعید ئاغاو محەمەد ئاغای عوبدولرەحمان ئاغاو جەمال بەگی عیرفانو حاجی ئیبراهیم ئاغای خەفافن.

بەو تەحرە لەڕۆژی (١٧)ی مانگدا لەلایەنی جەنابی حاکمی سیاسیەوە موبارەك بادیان بۆ نوسراو لەشاریشدا ئیعلان کرا.

ئێمەش بەناوی هاووڵاتیەکانەوە (خۆ ولاتیەکانەوە) موبارەك بادیو دوعای مۆفەقیو سەرکەوتنیان دەکەین.

پێشکەوتن:

ژ (٧٨)

بەئۆکتۆبەری ١٩٢١

(سەرچاوەی پێشوو)

له ناو او دیلانه که له سبریا هاتونه‌وه و ایستا له یونانداٴن ناوی ام دو کسه‌یشی تیا هیه بو زانینی کس و کاریان درج کرا سعید کوری حاجی حسن له نه‌وه (نوزی علی) خلق محله کو ... و غازی سلیمانی که صاکنی محله‌سوره له بغداد ام ... به ... استانبول .

وا اعلان کراوه که‌م ادرسه کاغذ بو اوانه که‌لای حکومت یونان بنومسریت پیان ده‌گات .

استانبول هلال احمر واسطه سیله سربادن اسارتدن قورتیله‌رق یونان حکومتی طرفندن توقیف ایدیلان صافلام اسرا میانده ... ۲ اوغلی ..

پێشکەوتن( سەرچاوەی پێشوو) ساڵی (٢) ژمارە ٨٣ (٤ ... ١٩٢١)

ئەوڕەحمان پاشای بابان

لە کتێبی(گەشتی ریچ بۆ کوردستان ــ ١٨٢٠) ل١١٧، وەرگێڕانی

محمەد حەمە باقی

فەرمانبەرێکی گەورەی پاشای سلێمانی
(عومەر ئاغای خەزنەدار)
لە کتێبی(گەشتی ریچ بۆ کوردستان ـ ١٨٢٠) ل٩٠، وەرگێڕانی
محمەد حەمە باقی

ئیسماعیل حەقی بابان نوێنەری بەغدا لە ئەنجومەنی مەبعوساتی عوسمانی
وەزیری رۆشنبیری لە دەوڵەتی عوسمانیدا ١٩٠٨
لە بڵاوکراوەی (عوثمانلی مبعوثلر) وەرگیراوە

| نـــاو | لاپـــەرە |
|---|---|

ئـ

## پ

پ



ت



ج



ح



خ

## ز



## ژ



## س

ش



ع



ف



ق

ك

## گ



## ل



## م

## ن



## هـ

**ناو** **لاپەڕە**

ئ

## ب

## پ



## ت



## ج

## ح

## د



## ڕ

ش

## ف



## ق



## غ

## ك



## گ



## ل



## م

## ن

# بەرهەم و بڵاوکراوەکانی نووسەر

١. خۆرگیران　　کورتە چیرۆك　　خرپینێوزمنگ　　١٩٨١

٢ ـ ڕاوەماسی　　ڕۆمان　　ستۆکهۆلم　　١٩٨٦

٣ ـ لەگێژاودا　　کورتە چیرۆك　　ستۆکهۆلم　　١٩٨٨

٤ ـ هەڵۆی سوور　　سیناریۆ　　سلێمانی　　٢٠٠١

٥ ـ پێکهاتنی چوارچێوەی ئابووریو　　سلێمانی　　٢٠٠٣

سیاسیی ـ چینی بۆرجوازی لەشاری سلێمانیدا.

٦ ـ التيارات والأتجاهات الأدبية والفكرية في القرن التاسع عشر ـ التآخي ١٩٧٢.

٧ ـ خانقين خلال ربع قرن (١٩٠٠ ـ ١٩٢٥)، خمس حلقات، ـ ((التآخي)) ١٠و ١١و ١٢و ١٣و ١٤ حزيران ـ ١٩٧٣.

٨ ـ خانقين خلال ربع قرن (١٩٠٠ ـ ١٩٢٥) ـ بحث ميداني ـ السليمانية ـ ٢٠٠٥

٩ ـ الرومانتيكية في الأدب الكردي ـ مجلة الثقافة، عدد (١) س (٤) ص (١٠١) ـ بغداد ـ ١٩٧٤.

١٠ ـ لماذا سادت اللهجة الگورانية في الأدب الكردي ـ مجلة الثقافة ـ بغداد ١٩٧٣ .

١١ ـ چەند لێکۆڵینەومیەك دمربارەی شەڕی پارتیزانی ـ خرپ نێوزمنگ ـ ١٩٨١.

12-Fadil Ahmad:Die Stellung der Frau in der Kurdischen Gesllschaft.
In: VIA- Magazin (Bonn) .3 (1991) S.1-20

* وتاری: دەوری ژن لەکۆمەڵی کوردستاندا (بەئەڵەمانی) لە گۆڤاری VIAدا بڵاوکراوەتەوە.

13-Fadil Ahmad:LUTTE ARMEE ENTRE LE MYTHE ET LAREALITE
In: HALKAWT HAKIM: Les Kurdes Par- delà .1,exode.Paris 1992

* وتاری خەباتی چەکدار لەنێوان ئەفسانە و ڕاستیدا. لەلایەن (د. هەڵکەوت حەکیم)ەوە کراوەتە فەرەنسیو لەکتێبێکدا ساڵی ١٩٩٢ لەپاریس بڵاوکراوەتەوە. ئەم وتارە لە گۆڤاری یەکگرتندا بڵاوکراوەتەوە و چەندین کەس لەسەریان نووسیووە.

14 -Fadil Ahmad: Die Kurdische Befreiungsbewegung zwischen Stammeskultur und politischer Erneuerung. Hildesheim.1994.

* کتێبی: بزوتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد لەنێوان کەلتووری عەشرەتگەری و مۆدێرنکردنەوەی سیاسیدا. ئەمە نامەی ماجستیری ساڵی ١٩٩٤ ە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ ـ ئەڵوەن و ئەفسانە | ڕۆمان | سلێمانی | ٢٠٠٤ |
| ١٦ ـ مێژووی بیری کوردی | لێکۆڵینەوە | سلێمانی | ٢٠٠٥ |
| ١٧ ـ الصقر الأحمر ـ | سيناريو | السليمانيه | ٢٠٠٥ |
| (ترجمة: شهاب القره لوسي) | | | |
| ١٨ ـ من بڕوام بەدیموکراسی کوردی نییە. | لێکۆڵینەوە | سلێمانی | ٢٠٠٦ |

